# کاروان

# 3

گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەیە
ئەمینداریێتی گشتیی رۆشنبیری ولاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

کانوونی یەکەم 1982



## لەم ژمارەیەدا

# نرخاندنێکی زانستییانە دەربارەی چیرۆکی منالان ۱۹۷۰ ـ ۱۹۸۲

نووسینی : عبدالستار طاهر شریف

■ **لە رۆژی ۲۸ـ۱۰ـ۱۹۸۲ ریکەوتی پێنجشەممە ئەم تۆژینەوەیە لـە هۆلی رۆشنبیری جەماوەر لە شاری هەولێـر لە کۆڕێکدا خوێندرایەوە .**

هەموو ئەو رووداوو بەسەر هاتانەی لە تەمەنی منالی چ لە قۆناغی کۆرپایەتیو چ قۆناغی ساوایەتی تووشی منالان دەبن شوێنەوارێك یان چەند شـوێنەوارێك لە ژیانیاندا جێدەهێڵنو بـە درێژایی تەمەنیان دەمێنێتەوە . وەك فرۆید لـە کاتی چارەکردنی هەندێ لە نەخۆشیەکانی ئەم راستییانەی بۆ ئاشکرا ئەبوو ، بە تایبەتی لە «لا شعور(*) دا» بە هەرحاڵ

بە باوەڕی ئێمەش بەسەر هاتەکانی پێنج ساڵی یەکەم لە تەمەنی منـــاڵ کارێکی گەورە ئەکەنە سەر دوا رۆژی . وە لەبەر رۆشنایی ئەم باوەڕو رایانە ئێمە روونی دەکەینەوە لەم تۆژینەوەیەدا ، یـــان لەبەر تیشکی رۆشنایی هەندێ لـــــە راکانی زانایانی دەروونیو پەروەردەیی، پێویستە خێزانو کۆمەڵ بایەخی تەواو بدەن بە پەروەردەکردنی منـــــاڵ ، بەتایبەتی کە خێزانو هەموو ئـــەو دامو دەستگایانەی خـــــەریکی پەروەردەکردنی منـــالانو دوارۆژیش لێپرسراون بەرامبەر بە وەچی تـــازەو دورستکردنیان ، بەجۆرێك لـــــە نەخۆشیەکانی کە جێگای مەترسین لە ژیانیاندا رزگار بوبێتن .

پێگەیاندنی وەچی تازە ئـــەرکێکی هاسان نیە بە تایبەتی بـــەرامبەر پەروەردەکردنی بە نرخترین ســـامانو سەرمایەی نەتەوەو دوا رۆژی نەتەوە ، یەکێ لە زانا پەروەردەییەکان ئەڵێ :

« مناڵ پێوەری سامانو سەرمایەی نەتەوەیە ، ئەو نەتەوەیە دەوڵەمەندە کە منالانی بە جوانی پەروەردە کراون » .

سامانی تر وەك نـەوتو کشتوکاڵو سامانەکانیتر هەموو بەرامبــەر سامانی مناڵ نرخێکی ئەوتۆیان نیە . دووریش نیە گەلی یابانی لە دوورگەکانی یابان کە سامانی نەوتو زەوی کشتوکاڵیان نیە ، یان کانی جۆراو جۆریان زۆر کەمە ، سەرەڕای ئەوەش هـــەموو بازاڕەکانی جیهانیان داگیرکردووە بـــە بەرهەمی پیشەسازی یابانی کە هەموو کەرەستە خامەکانی لە دەرەوەی یابان پەیدا ئەکەنو دووبارە لە کارگەکانیان دروســـتی دەکەنەوە . دوور نیە هۆیـــــە سەرەکییەکەی ئەم پێشکەوتنـــــە ئەگەڕێتەوە بۆ جۆری پەروەردەکردنی

---

(*) **مەوزوعی « لا شعور » لای فروید کە بۆ بەڵگە هیناومانەتەوە مانای ئەوەنیە ئێمە باوەڕمان بـــــەم مەسەلەیە هەیە وەك فرویـد بۆی چووە .**
**« نووسەر »**



منالانیان .

له بواری پەروەردەکردنی منـــالو رۆلی چیرۆك لەم بوارەدا ، هـــەول دەدەین چەند تیشکێك بخەینه ســەر چەند بوارێکی گرنگ له ژیانی منـــال ، به تایبەتی مەسەلەی چیرۆکی منالانو بابەخدان به منال لەو چیرۆکانەی باسیان دەکەینو ئەیانترخێنین ، بەلای ئــەم تۆژینەوەیه سێ لای زۆر گرنگ هەیە، ئەبێ شیی بکرێنەوه :

**١ ـ جۆری چیرۆکەکه ، ئایا چیرۆکی مناله یان نا .**

**٢ ـ ناوەرۆکی چیرۆکەکه لەگەل دیمەنو تەکنیكو ووشەو رســـتەوە گونجاوون لەگەل تەمەنەکانی منالان یان نا .**

**٣ ـ منال که جێگای مەبەســـتی چیرۆکەکەیه ئایا لـــه بواری پەروەردەو زاخاو دانی بیروباوەڕی منالەکه به شێوەیکی زانستییانه رەفتاری لەگەلدا کراوه یان بـه پێچەوانه .**

ئەم سێ بواره یان باشتر بلێین ئــەم سێ عونسرانه له یەکتری جیـــاواز ناکرێنەوه له جیهانی چیرۆکی منالان .

ئەرکی چیرۆکنووسی منـــالان ، ئەرکێکی وا هاسان نیه به چەند دێرێك یان به چەند ووشەیێك کۆتایی پێ بێنین لەم تۆژینەوەیەمانـــدا ، بەلـــکو پێویستیمان به تۆژینەوەیێکی فراوانتر هەیه لەسەر هەلبژاردنی چیرۆکنووسی منالانو چیرۆکی منالان ، هـــەریەکێ هەلسیو دەست بداته پێنووسو چەند لاپەڕەیێك رەشکاتەوەو ناوی لێ بنـــا چیرۆکی منالان ، وابزانین بـــەرەو هەلدێرێکی خەراپمان ئەبەنو دوا رۆژی منـــالەکانمانیش دەخـــەنه وەزعێکی نالەبارەوه ، یان هەر نووســـەرێك ـ شەلم کوێرم ناپارێزم ـ چیرۆك بـۆ گەورەو بۆ منالو چیرۆکی کورتو درێژو شیعرو رەخنەی ئەدەبیو شانۆگەریو هەموو بابەتەکانی ئەدەب بکاتــه بواری نووسینەکانی بەبێ ئەوەی گوێ بداتـــه مەسەله تایبەتیەکانی هەریەکه لـــەو بابەتانەی بۆیان دەنووسێو وەیـــان شارەزایی تەواوی نەبێ له هەریەکه لەو مەوزوعانه ، ئەوا ئەوکاته بێ گومـــان ئێمەی کورد له جیهانی چیرۆکی منـــالان نومرەی « سفر »یان « سێ سفر »مان بۆ دائەندرێ .

زۆر جاریش هەندێ له مامۆستایانی قوتابخانه سەرەتاییەکان تەنها بـــه حوکمی ئەوەی مامۆستای منـــالانو دەستی نووسینیانیش هەیه ، ئەوا ئەبێ چیرۆك بۆ منالان بنووسن ، بەبێ ئەوەی ئەو مامۆستایه شارەزایی تەواوی هەبێ له بواری زانستی دەروونو پەروەردە کردنی منال .

کەواته چیرۆکی منـــال هونەرێکی خاوەند هەلو مەرجی تایبەتی خۆیەتی، هەرچەندە هونەرێکی ســـادەیه وەك سادەیی منال ، بەلام له هەمان کاتـدا هونەرێکی گەورەو مەزنه وەك گەورەییو مەزنی منال ، هونەرێکه پێویسته لەسەر خاوەندەکەی که چیرۆکنووسەکـــەیە شارەزاییکی تەواوی هەبێ لەسەر هەموو ئەو قۆناغانەی منال پێیدا تێپەڕ دەبێ له نەشو نەما کردنی زانیاریدا تا ئەگا بـه تەمەنی هەرزەکاری .

له قۆناغی دووەمی نەشو نەمـــا کردنی زانیاری لای منال که له تەمەنی ٢ ـ ٧ سالانه ، ئەبێ چیو چۆن بۆ منال بنووسین . یان له قۆناغی سێیەمی نەشو نەما کردنی له تەمەنی ( ٧ ) سالان چیو چۆن دووباره بۆ منال بنووسین ، کەواته ئەبێ پێش ئەوەی چیرۆکنووسێ چیرۆك بۆ منالان بنووسێ ، ئەبێ پێش ئەوەی چیرۆکنووسی چیرۆك بۆ منـالان بنووسی ، ئەبێ شارەزاییکی تـەواوی هەبێ دەربارەی خاسیەتو سروشتی ئەم قۆناغانه ، لەم بارەیەوه جان پیاجێ ئەلێ :

« له قۆناغی دووەمی نەشو نەمـــا کردنی زانیاری لای منال ، تا تەمـەنی حەوت سالان ، کۆمەل دەست ئەکا به کارتێکردن لەسەر منال ، بەتایبـەتی لەسەر رەوشتو بیری ، لـه سەرەتای ئەم قۆناغه منال دەست ئەکا بـــه

فێربوونی زمان‌و دووپاتکردنەوەی ئەو ووشانەی گەورەکانی دەوروپشتی زۆر دووپاتی ئەکەنەوە . لەگەڵ تێگەیشتنی منداڵەکانیان تێگەیشتنێکی سەرەتایی‌و [illegible] . هەروەها ناتوانێ بەرێك‌و پێکی ووشەکانی کە فێری ئەبێ . لە رستەی رێك‌و پێك رێکیان بخا . تەنها مەگەر لە رستەی زۆر کورت . وە لەم قۆناغە [illegible] فکری پەرتە‌و بڵاوی دەست ئەکا بە [illegible] لەگەڵ زمانداو لەم تەمەنەش [illegible] ئەوی بە فکریدا رەت دەبێ [illegible] ناخەوتنەوە . هەروەها [illegible] رەوشتی مەرکەزیەتی خودی [illegible] Egocentrism وە لەم [illegible] منال کۆتاییان [illegible] .

لە قۆناغی سێیەم لە ( ٧ ـ ١١ ) [illegible] منال دەست دەکا بە [illegible] . هەرچەندە لە رادەی [illegible] محسوس " ئەمێنێتەوە . [illegible] دەکەوێ‌و ووشەکانی [illegible] بە جۆرێك لــــە [illegible] لەگەڵ [illegible] نیزیکی [illegible] ووشە . وە لەم قۆناغە مەرکەزیەتی خودیشی بەرەو نەمــــان دەڕواو تێگەیشتنی عەقلی‌و تێگەیشتنی موجەررەدیشی لا پەیدا دەبێ‌و فراوانتر دەبێ Concept . وە لەم قۆناغە رەوشتی کۆمەلایەتی فراوانتر دەبێ‌و وورده وورده‌ش فێری کرداری فیکری سەرەتایی دەبێ .

لە قۆناغی چواردم لــە ( ١٢ ـ ١٥ ) سالان . وە لەراستی‌دا تا کۆتایی ژیان . تەمەنی هەرزەکاریش لەم قۆناغــــە دەست پێ دەکا . لەم قۆناغـــە فیکری مجرد دەست پێ دەکاو تێگەیشتنی منال فراوانتر دەبێ‌و تـــا ئەگا بە پلەی بەکارهێنانی " رەمز "و معادلەو بڕیاردان لەسەر هەرشتێ بیەوێ‌و دیان رەخنەی لێ بگرێ . لە لایەکی تردوە ڤیگۆتسکی Vygotsky دەڵێ :

دەربارەی هەسکردنی عــــەقلی Cohcepts پەیوەندی بــە زمانەوە هەیە . لەسەرەتای ساڵی دووەمەوە تا کۆتایی ژیان . کەوانە لەو قۆناغەی منال بە پلەی مەرکەزیەتی خوددا تێپەڕ دەبێ . پێویستە چیرۆکی منالان ســــەرنجیان رابکێشی بەرەو جیهانێکی خەیالاوی .

لە هەمان کاتا رستەو ووشــــەکانی چیرۆکەکە جگە لە ناوەرۆکەکەی هــــانی خوێندنەوەی بداو منال بە خۆشەویستی خوێندنەوەی چیرۆك رابهێنێ . لە لایەکی تردوە پێویستە پالەوانەکانی چیرۆکی منالان ■ خاوەند رەوشتێکی گونجاوبن لەگەڵ کۆمەڵداو نەبنە هۆی دوورستبونی گرێ‌و شەڵەژاندنی ژیانی منــــالان ، هەروەها پێویستە رەوشتی پالەوانەکان سادەبن‌و منالان بتوانن هەزمی بکــەن‌و کار بکاتە سەر رەوشتیان بـــــەرەو ئیجابیەت نەك سەلبیەت .

لایەنی دووەم ووتمـــان جۆری چیرۆکەکەیە ، یان باشتر بلێین ناوەرۆکی چیرۆکەکە ، لەگەڵ دیمەن‌و تــــەکنیك‌و ووشەو رستەوە گونجاوون لەگــــەڵ تەمەنەکانی منالان یان نا .

**بەهەر حاڵ دەبێ چیرۆکی منال بـــە زمانی منال بنوسرێ ، سادەو بێ‌گـــەرد بێ ، بەو ووشانە بنوسرێ کەوا منالەکە تێی بگاو ووشەکانی بەلاوە نامۆ نەبن ، بۆ نموونە منال لە تەمەنی شەش سالان لە ووڵاتە پێشکەوتووەکان لە سنووری ٢٥٠٠ ووشە دەزانن ■ .**

خۆ ئەو تۆژینەوانەی لەسەر منالانی بەغداش کراون لـــە سنووری (٩٠٠) نۆسەد ووشە تێپەری نەکردوە کەواتە ناوەندی ووشەکان لای یـــەك منال .

- **■ مەبەستمان لە پاڵـــەوان لێرەدا پاڵەوانە سەرەکیەکەیەو پاڵەوانی رەوشت خەراپیش بـــــــە بەراوردکردنەوە لەگەڵیـــــــدا دەناسرێ .**

- **■ لەرووی ژمارەوە ووشەکانی منال لە هیچ تەمەنێکدا راوەســـتاو نیە، منال هەیە لەتەمەنی شـــــەش سالان ٥٠٠ ووشە دەزانێ منالی واش هەیە گەلێ لەم ژمــــارەیە زیاتر ئەزانێ .**

هەرچەندە زیرەکترین منال لە دراسەتەکەی « الکبیسی » گەیشتۆتە ( ١٢٥٠ ) ووشە ( م : ل ١٢٧ ).

تا ئێستاش تۆژینەوەمان نیە لەسەر

منال کورد لەم تەمەنەو لە هەموو تەمەنەکانیتر . هەرچەندە ئێمە ئێستا خەریکی دراسەتێکی وەهاین لەسەر سنووری ووشەکانی منالی کورد لە تەمەنی شەش سالان وەك نامەیەکی دکتوراو هێشتان تەواومان نەکردووە. کەواتە ناوەرۆکی چیرۆکی منال نابێ لە رووی بەکارهێنانی ووشەوە لە سنووری ووشەکانی منال لابدا بە پێی تەمەنی منالەکە . خۆ ئەگەر لە سنووری ووشەکانی منال لایداو تێپەری کرد ئەوا ناتوانین ناوی بنێین چیرۆکی منالان(٢) . ئەو کاتە دەتوانین بلێین چیرۆکنووس خۆی راستەوخۆ خستۆتە قالبی منالیەوەو بە زمانی خۆی بۆ منال دەنووسێ . لە لایەکی ترەوە نابێ وا تێبگەین چیرۆکی منال دەبێ بریتی بێ لە کۆمەلێ ئاموژگاریو ریزکردنی رستەو ووشەی بریقەدار . بە تایبەتی منال لە تەمەنی چوار پێنج سالان تا شەش سالانیش هێشتان لە مەلبەندی خوددا ئەژێو خۆی بە مەلبەندی ژیانیش دەزانێو ماملەت کردن لە گەلیدا بە ئامۆژگاری هیچ لە مەسەلەکە ناگۆرێ . خۆ لە رووی ناوەرۆكو مەبەستو ئامانجی چیرۆکەکە ئەوا ئەم لایەنە لە هەموو لایەنەکانیتر گرنگترو پر مەترسیترە . بۆ نموونە هەموو ئەو راستییە ئەزانین کەوا چۆن نازییەکانی ئەلمانیاو فاشیەکانی ئیتالیا لە بواری پەروەردەکردنی منال. چۆن کاریان کردە سەر وەچەکانیانو منالانی ئەلمانیاو ئیتالیایان لەسەر بناغەی نازیەتو فاشیەت پەروەردە کردو گیانی رەگەزپەرستییان چاند لە مێشکیاندا.

کەواتە لە رووی ناوەرۆکی چیرۆکی منال پێویستە ئامانجەکەی



پەروەردەکردنی منال بێ‌رووی هۆشیاری کۆمەلایەتیو هەستکردن بە لێپرسراوی تاك بەرامبەر بە کۆمەلو بە هێزکردنو پەرەپێدانی هاندەر Drive بەرەو لایەنە ئیجابیەکانی کۆمەلگاکەی تیایا دەژێ نەك بەرەو سەلبیاتەکانی . بە جۆرێك منال لە دوا رۆژدا توانای خۆ گونجاندنی تەواوی هەبێ لەگەل رووداوەکانی مەلبەندەکەی . کەواتە دەبێ قارەمانی چیرۆکی منال هەموو ئەو رەوشتانەی تیادا هەبێ کەوا قارەمانەکە بە بەرژەوەندی کۆمەلەکەیەوە ببەستێتەوەو لە ئەنجامیشدا ئەو منالەی چیرۆکەکە دەخوێنێتەوە بە مێژوی نەتەوەکەیەوە گرێ بداو سەیری دوارۆژێکی بەختەوەریشی بکا بۆ خۆیو کۆمەلەکەیو دراوسێکانی . بەو گیانە پاکە پەروەردەی بکا کەوا رقو کینەو

بوغزو هەموو رەوشتە خەراپەکانی دژ بە مرۆڤایەتی لە قاموسی مێشکیا جێگایان نەبێتەوە . لێرەدا خالی سێیەمی تۆژینەوەکەمان ئەنجام دەدرێ . چیرۆکنووسیش مەبەستی لە چیرۆکەکەی تەنها منالەو بەس .

لەلایەکی ترەوە نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ لەم تۆژینەوەیەدا کەوا دەستگای نەتەوە یەکگرتوەکان بریاری داوە سالی ١٩٧٩ بکرێتە سالی جیهانی منالان. ئەم بریارەش گرنگیتی لە خودی خوێدا دەردەکەوێ کە دەلێ :

« پێویستە هەموو جۆرە تواناو وزەیەك لە پێناوی منالو نەشو نەما کردنی منال برەخسێنرێ . چ لە بواری بیرو هۆشو رووناکبیریو کۆمەلایەتییەوەو . چ لە بواری تەندروستیی لەشو روخساریەوە » .

ئێمە دەربارەی سالی جیهانی منال وتوومانە : « لە سەرانسەری جیهاندا بەتایبەتی لە وولاتە پێشکەوتوەکاندا لە سالی ١٩٧٩ زوربەی رێکخراوە جەماوەرییەکانو پەروەردەییەکانو رۆشنبیرییەکان لەگەل نووسەرانو هەموو ئەو گرووپانەی پەیوەندیان بە منالەوە هەیە جگە لە دەستگاو کەرەستە میرییەکان خەریکی ئاهەنگ گێرانو کۆر بەستنو پێشکەشکردنی باسو تۆژینەوەی نوێو تازەبابەت بوون لەسەر منالان ، گومان لەوەشدا نیە منالانی



ولاته سەرمایەدارەکان بە تایبەتی منالانی چینی بورجواو سەرمایەدارەکان زیاتر لە منالانی رەش‌و رووت‌و چینی زەحمەتکێشەکان لە ولاتە سەرمایەدارەکان بە چاوەدێری‌و پەروەردەو بە خۆشی ژیان لەسەر زەمین لە سەدەی بیستەمدا شادبوونە، هەروەها منالانی ولاتە سۆشیالیستەکان بەگشتی بێ فەرق‌و جیاوازی وەك یەك ئەژین‌و پێکەوە لەسەر زەمینەی ولاتەکانیاندا شادمانن ، بەلام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ یان بێ ئاگابین لە منالە چەوساوەکانی ولاتە دواکەوتوەکان یان ئەو ولاتانەی تا ئێستا لە ژێر چنگی ئیمپریالیزم رزگاریان نەبووە ، نابێ منالانی فەلەستین لە تەل الزعتەرو خواروی لوبنانمان لەبیر بچێ کە نەك لەسالی منالانی جیهانی بێبەشن ، بەلکو لە تەنیا یەك رۆژ خۆشیش لەسەر ئەم زەمینە پان‌و پۆرەدا بێبەشن ■ .

ئنجا نازانم دەبێ ئێمەی کورد چی بلێین دەربارەی منالی کورد لە پاوەو سەقزو مەهەبادو سنەو مەریوان‌و سەردەشت‌و هەموو شارو لادێکانی کوردستانی ئێران ؟ » ( ٤ : ل ٥ـ٦ )

خۆ زۆربەی زۆری منالانی هەندێ لە ولاتانی ئەفریقایی تا ئێستاش لە برسانا تووشی دەها نەخۆشی دەبن‌و دەمرن . ئەم تاقمە منالانە نەك لە پەروەردەو بەخێوکردن بێبەشن ، بەلکو هەر لە تامی ژیانیش لەسەر زەویدا بێبەشن‌و ئەبێ بەشیان مردن بێ .

مصطفی صالح کەریم دەربارەی منالی کورد زۆر جوان بۆی چووە کە لە کوردستانی ئێراندا چۆن دەژین :

« منالانی کورد لە سالانی دوایی سەدەی بیستەما لەژێر تەوژمی هەندێ رژێما لە سادەترین مافی رەوایان بێبەرین ، منال لەبەر دایك هەلئەگیرێ‌و هەیانە لە بەندیخانەدا مەلاشووی هەل ئەدڕن‌و هەشیانە دەمیان لە مەمکی دایکەکانیان ئەکەنەوەو بەرەو ئەشکەوتەکان راو ئەنرێن ، دیاریی ئەوان لە سالی منالانا کوشتن‌و برین‌و«غەزای پیرۆزە » !! ( ٥ : ل ٧٠ـ٧١) .

گومان لەوەدا نیە نووسەری ئەم چەند دێرانەی سەرەوە مەبەستی لە رژێمی خوومەینی رەگەزپەرستە کە بەناوی « غەزای پیرۆزەوە » بە سوونی ورگی منالانی کورد هەلئەدڕن .

هەرچەند نووسەرەکە لە کوردستانی عیراقداو لە شاری سولیمانی ئەژێ‌و پێویستی بەم هەموو ترسە نەدەکرد لە رژێمی خوومەینی .

لێرەدا ئاشکرایە ئەم تۆژینەوەیە چارەسەری گیرو گرفتێك دەکا ئەویش نووسینی چیرۆکە بۆ منال ، وە واش دیارە ئەم گیروگرفتە ئیمڕۆ لە بواری ئەدەبی کوردیدا پانتاییەکی زۆری گرتۆتەوەو ئیتر نابێ لەمە زیاتر چاوی خۆمانی لێ بنوقێنین ، ئەو نووسەرانەی شارەزای منال نین ، وەیان زانینێکی ئەوتۆیان نیە دەربارەی زانستی دەروونی‌و قۆناغەکانی نەشو نەما کردنی زانیاری لای منال‌و نووسینەکانیانیش کەلکی منال نادا ، ئەوا لەم تۆژینەوەیە بۆ خوێنەری بەرێزی ئاشکرا دەکەین ، وە بۆ ئەوەی تۆژینەوەکە سنوورێکی تایبەتی هەبێ‌و پەرش‌و بلاو نەبێ‌و جێگای رەخنەی کەمتر بێ ، ئەوا هەول دەدەین :

**١ ـ نموونەی چەند چیرۆکێکی منالان کە دوای سالی ١٩٧٠ چاپکراون تا سالی ١٩٨٢ لەسەریان بدوێین .**

**٢ ـ ئەم تۆژینەوەیە ئەو چیرۆکانە ناگرێتەوە کەوا لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا بلاوکراونەتەوە .**

**٣ ـ ئەم تۆژینەوەیە ئەو چیرۆکانە**

**■ ـ لە کاتی نووسینی ئەم تۆژینەوەیەماندا لە ئەیلولی ١٩٨٢ زایونیزمە فاشیەکان بەسەرکردایەتی مناحیم بیگنی فاشی لەگەل چەتەکانی سعد حدادو میلیشیاتی کتائب بۆ ماوەی ٣٦ سەعات کوشتن‌و برین‌و زندە چال کردنی زیاتر لە چوار هەزار ژن‌و پیاو منالی فەلەستینیان کرد لە رەشمال نشینەکانی شاتیلاو سەبرا . ئەو کارەساتەی دلی هەموو دانشتوانی جیهانی هەژاندو عالەم نارەزایی خۆی دەربڕی دژی ئەم کارە ساتە کە دووبارە سەدەها منالی فەلەستین تیا زندە چال کران .**

**« نووسەر »**

**ناگرێتەوە کەوا لە زمانی بێگانەوە گۆڕاونەتە سەر زمانی کوردی یان لـــە فۆلـــکلۆری کوردی‌یەوە وەرگیراوون .**

**٤ ـ ئەو چیرۆکانەی گراونەتە کتێبو لەم توژینەوەیە باسیان نەکراوە مانای وا نیـە کەوا بایەخ نەدراوە پێیان .**

به پێی ئەم بۆچوونەی ئێمـــــه توژینەوەکەمـــــان توژینـــــەوەیکی زانستی‌یانەیە ، لەبەر ئەوەی چارەسەری گیروگرفتێك دەکا کە هەیە ، هەروەها لەبەر ئەوەی لەسەر ڕێبازی پرۆگرامی توژینەوەی زانســتی چارەســــەری مەوزوعەکانی دەکا ، لە لایەکی تـرەوە ئەنجامی توژینەوەکەو سـنوورەکەی دیاری کردووە .. هـــەر بۆیە داوای لێبوردن دەکەین لەو چیروکنووسانەی لەم توژینەوەیە رەخنەیان زۆر هاتۆتـە سـەرو چیرۆکەکانیان بە بێ کەلك لە قەلەم دراون ، ئەوەش ئاشکرا دەکەین کـــە توژەر زۆربەی زۆری چیروکنووسەکان تەنها بەناو دەیانناسێ‌و هیچی تر .
هەولیش دەدەین لە دەرفەتێکی تـردا فراوانتری بکەین‌و وەك کتێبێـــــك بیگەێینە دەست خوێنەواری بەڕێز .

**( ١ ) هەلەشەیی : نووسینی رضا شوان چیرۆکی منالان**

**چاپخانەی ( سـلمان الاعظمی ) بەغدا ١٩٧٠**

کتێبی هەلەشەیی بریتی‌یە لـــە ٢٢ لاپەرە لە قـــەوارەی ١٧ x ٢٤ سم چاپکراوە وە بە پیتی قەوارەی بۆلد . وێنەکانی چیرۆکەکە رەش‌و ســپین‌و گونجاوون لەگەل ناوەرۆکی چیرۆکەکە . هەلەشەیی بریتی‌یە لە یەك چـــیرۆکی درێژ بۆ منالان . هەرچەندە چیرۆکەکە درێژە بەلام منال لەکاتی خوێندنەوەی یان لەکاتی گیرانەوەی بۆ منالی بچووك لە تەمەنی ٦ ـ ٨ ســالان لێی وەڕس نابێ .

چیرۆکـەکـە لەڕووی داڕشـــتنی ناوەرۆکەکەی چیرۆکنووس سەرکەوتووە لە زاخاو دانی مێشکی منالان بــــە خۆشەویستی تەبرو توالو هـــەموو جۆرە بالندەیێك ، لە هەمان کا تـــدا خۆشەویستی کەو ، لە هەموویان زیاتر، بەهای هەلەشەیی‌و پەلە کردن لــــە بریاردان رسوا دەکا ، لەگەل چەسپاندنی بەهای « وەفا » لەسەر رەوشـــتی « کەوەکە » .

بەگشتی چیرۆکنووس سەرکەوتووە لە داڕشتنی چیرۆکی « هەلەشـەیی ».

**( ٢ ) پیاوە بچکۆلەکە :**
**نووسینی : فەرەیدون عەلی ئەمین چیرۆکی منالان**

**چاپخانەی « سلمان الاعظمی » بەغدا ١٩٧٢**

کتێبی پیاوە بچکۆلەکە ، بریتی‌یە لە ٤٨ لاپەرە لە قەوارەی ١٧سم x ٢٤سم و بە پیتی بولد چاپکراوە . بریتی‌یە لە هەشـــت چیرۆکی کورت‌و چەنـــد هونراوەیێك کە ئێمە باسی هۆنراوەکان ناکەین . لەڕووی دیمەن‌و پیتەکانی کــە چاپکراوە پێی هەروەها وێنەکانی ناوەوەی چیرۆکەکان زۆر گونجاوون لەگـــەل منالان .

چیرۆکی یەکەمی کتێبەکە لەژێـــر ناونیشانی « بەرخۆلەو کۆترە کێویلەو منال ». ئەم چیرۆکە بەهای « ئاشتی » لە مێشکی منالان زاخاو دەداو«بەهای» شەڕیش رسوا دەکا .

لە چـــیرۆکی « پیاوە بچکۆلەکە !! » منالان فێری پەیڕەو کـردنی چۆنێتی پەڕینەوە دەکا لە شـەقامەکاندا لەکـاتی تێپەڕ بوونی ئۆتۆمۆبێل . لەگەل گیانی هاریکاری .

لە چیرۆکی «جووجەلەو ڕێوی» باسی فێلی ڕێوی دەکلو نەرێت‌و رەوشـــتی زولم‌و زۆرداریش رسوا دەکا .

بەگشتی چیرۆکەکانی تری بەهـــای «ئازار نەدان‌و پاك‌و تەمیسی‌و پارێزگاری نیزامی قوتابخانەو خۆشـــەویستی‌و هاریکاری‌و چالاکی » ئەچەسپێنێ لـــە مێشکی منالاندا‌و چـــیرۆکنووس زۆر سەرکەوتووە لە چیرۆکەکانی بۆ منالان.

**( ٣ ) شەمامە :**

**نووسینی جەزا عــەلی ئەمین چیرۆکی منـــالان**

**چاپخانەی ـ دار الحریـــة ـ بەغدا ١٩٧٨**

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە ٦٩ لاپەرە بـــە قەوارەی ١٧سم x ٢٤ سم وە بەپیتی قـــەوارە ١٤ چـــاپکراوە . کتێبی « شەمامە » بریتی‌یە لە چواردە چیرۆکی کورت .

وێنـــەکانی چیرۆکەکان دەگونجێن لەگەل منالی کورددا، بەلام یەکێ لە کەمو کورتیەکانیان ئەوەیە رەنگاو رەنگ نیین، ئەمەش کار دەکاتە سەر ئەوەی ئەوەندە سەرنجی منال رانەکێشن .

چیرۆکی یەکەم : « ئاوا لەشـــکری ماران شکا » چیرۆکەکە لەســـەر زمانی بازو مار بۆ منالانی نووسیوەتەوە ، ئەم چیرۆکە گیانی یەکیتی‌و هاریکاری زاخاو دەدا لە مێشکی منـالان‌و چیرۆکنووس زۆر بە جوانی بۆ مەبەستەکەی چووەو بەراستی بە زمانی منال‌و عەقل‌و هۆشی منال رەفتاری کردوە ، ئەم چیرۆکــە دەگونجێ بۆ منالان لە تەمەنی ( ٥ ـ ٨ ) سالان بۆیان بخوێندرێتەوە وە لـــە تەمەنی ٩ ـ ١١ سالان منالان خۆیـــان بیخوێننەوە .

چیرۆکی دووەم « قەلێك خـــەوەکەی

نەهاتە دی » ئەم چیرۆکەش خۆپەرستی و ئەنانیەت بۆ منالآن رسوا دەکاو بە ڕەوشتێکی خەراپی دەناسێنێ بە منالآن. لەسەر زمانی قەلە رەشێکدا . زۆر جوان بۆ مەوزوعەکە چووەو چارە سەری کردوە . وە لە وانەیە ئەم چیرۆکە دەستی منالّ بدا لە تەمەنی هەشت ساڵان بەبانەوە .

لە چیرۆکی سێیەم « کۆترو درەخت » مێشکی منالّ زاخاو دەدا بە بیروباوەڕی هاریکاری و گرنگی زەوی و خاك . لەگەلّ ناساندنی منالّ بە هەر دوو وەرزی هاوین و زستان . هەروەها باوەڕ بە خودی خۆت لە ژیاندا . ئەمەش لەسەر زمانی کوترو پیرەدارێك .

لە چیرۆکی « لقە دار گوێزێکی ئەستوور » لەم چیرۆکەدا نووسەر سەرکەوتوە لە چارەسەرکردنی مەسەلەی لە خۆبایی بوون . یان گیانی تەریکی و تەریك بوونەوە لە نەتەوەو قەومەکەت. ئەمەش لەسەر زاری «لقە دار گوێزێکی ئەستوور »و لالۆ پیرۆت .

لە چیرۆکی پێنجەمدا لە ژێر ناونیشان « مریشکە کونج ،» دەتوانین بڵێین چیرۆکنووس زۆر سەرکەوتووە لە زاخاو دانی مێشکی منالآن بە گیانی یەکێتی و بایەخدانی دایك بە پەروەردەکردنی منالّ. ئەمەش لەسەر زمانی مریشکە کونج و جووچکەکانی .

لە چیرۆکی هەشتەمیدا لەژێر ناونیشانی « شووتی کۆلە » ئەوەندە سەرکەوتوو نیەو زۆریش زەحمەتە منالّ لێی تێبگاو سوودی لێ وەربگرێ.

بەلآم لە چیرۆکی نۆیەمدا لەژێر ناونیشانی : « ئەو بەردەی نەڕوابووە!» سەرکەوتووە لە پەروەردەکردنی منالّ بە گیانی یەکێتی و عەزم و سەبرەوە .

لە چیرۆکی دەیەمدا « راوە گورگ » دیسان سەرکەوتووە لە فێرکردنی منالّ چۆن دوو شتی دژ بەیەك یان دوژمنی یەکتر پێکەوە بەخێو ناکرێن هەروەها بە بایەخدان بە بەهای سروشت .

لە چیرۆکی یانزەیەمیندا لە ژێر ناونیشانی « کەس بەتەنیا ناژی » دیسان گیانی یەکێتی و هاریکاری زاخاو دەدا لە مێشکی منالّدا .

وە لە چیرۆکی « مام هۆمەر » ئەوە فێری منالّ دەکا کە خاوەند بەڵێنی خۆی بێت و ئەو شتانەی نهێنی یە نەیدرکێنێ. وەیان لە کاتی لێقەومان چۆن خۆی رزگا بکات .

بەلآم نووسەر لە چیرۆکی « ئەسپ و رێوی » کە دوا چیرۆکی کتێبەکەیە ئەوەندە سەرکەوتوو نەبو منالّ بە هاسانی لێی تێ ناگا .

بەگشتی چیرۆکەکانی « شەمامە » چیرۆکی منالآنەو منالّ گەلێ سوودیان لێ وەردەگرێ و هانی منالّ دەدا بۆ خوێندنەوەیان و بە تایبەتی ئەگەر چیرۆکەکانی « شەمامە » سەر لە نوێ لە چاپ بدرێنەوەو بایەخ بە دیمەنی کتێبەکەو وێنەکانی ناوەوەی بدرێ و بەرەنگاو رەنگ چاپکرێن . ئەوەندەی تر سوود بەخشتر ئەبێ .

وە وا دەردەکەوێ لەم توێژینەوەیەماندا لەسەر « گروگالّ »و « شەمامە » زیاتر دواوین وەك لە چیرۆکەکانی تر . ئەم رێبازەش تەنها بۆ بەراوردکردنی دوو کتێبی چیرۆکی منالآن ، یەکێکیان سەرنەکەوتوو دووەمیانیش سەرکەوتوو.

**( ٤ ) سروودی شادمانی :**

**نووسینی عەبدوللا کەریم مەحموود**
**چیرۆکی منالآن**

**چاپخانەی کوردستان ــ هەولێر .**
**١٩٧٨**

ئەم کتێبە بریتی یە لە ٣١ لاپەڕە لە قەوارەی ١٢ سم × ٢٢ سم وە بە پیتی ١٢ چاپکراوە . وێنەکانی ناوەوەی لە رۆژنامەو گۆڤارەکان هەلّقەندراوەو بە لاپەڕەکانی کتێبەکەوە لکێندراوە .

« سروودی شادمانی » بریتی لە ٩ کورتە چیرۆك بۆ منالآن . چیرۆکی یەکەمیان لە ژێر ناونیشانی « یارمەتی و سەرکەوتن » زۆر لەم چیرۆکە ووردبینەوە ئەشێ ناوی بنێین موحازەرەیێکی سیاسی و چیرۆکی منالآن بەم جۆرە نانووسرێتەوە .

بەلآم لە چیرۆکی « نازەو شاخەوان » کەمێ بەلای چیرۆکی منالآنەوە چووەو لە چیرۆکی « کەوە ئاوارەکە » سەرکەوتوو ترە .

بەلآم لە چیرۆکی « قوتابخانەکەی ئاوایی » وا بزانم لەگەلّ چیرۆکی یەکەمدا جیاوازێکی ئەوتۆی نیە لەرووی ناوەرۆکەکەی و ناشێ ناوی لێنبرێ چیرۆکی منالآن .

ئەگەر بگوازینەوە بۆ دوا چیرۆکی کتێبەکە لەژێر ناونیشانی « قوتابی ژیر » ئەوا ئەم چیرۆکە راپۆرتێکی سیاسی تەواوە دەبا بزانین چیرۆکنووس چی دەلّێ :

« .. کوڕی شیرینم لێرە هەموو کەس وەکو یەك دەژی جیاوازی لە نێوان کەسدا نیەو چەوسانەوەی چینایەتی نیە . لە باوکم پرسی چەوسانەوەی چینایەتی چی یە ؟! باوکم ووتی : هیچ کەس کەسانی تر ناچەوسێنێتەوە سامانی گەلّ لەژێر دەستی تاقە کەسێکدا نیەو میللەت خاوەنێتی » .

بەم جۆرەو بەم شێوەیە منالّ دەخاتە گێژاوی زۆرانبازی چەوسانەوەی چینایەتی .. خۆی کردۆتە منالّ و چیرۆکی بۆ خۆی نووسیوەتەوە .

بەگشتی ئـەم کتێبەش چ لەرووی ـیمەنو چ لە رووی ناوەرۆکەکەوە ناشێ ـوی لێبندرێ چیرۆکی منالآن . واش ـەر دەکەوێ چیرۆکنووس لەسەر ئـەو ڕێبازە رۆیشتووە کە دەڵێ پێویـستە ئێمە چی دەخوێنینەوە لـە کتێبی سیاسیدا وەك خۆی بیگوازینەوە بۆ چیرۆکی منالآن . خاوەند ئەم باوەڕانە وا بزانین لەگەڵ منـالآ نەژیاوونو شارەزایی تەواویان نیە لەسەر ئەدەبی منالآن یان سایکۆلۆژی منال .

**( ٥ )گروگاڵ :**

**چیرۆکی منالآنە .**

**نووسینی عباس محمد حسین .**
**چاپخانەی شارەوانی هەولێر ـ ١٩٧٩**

گروگاڵ بریتی یە لـە ( ١٠ ) چیرۆکی کورت . چیرۆکی یەکەمیان لە ژێـر ناونیشانی « منالێکی بێ دایكو باوك ». گشتی چیرۆکەکان لە شێوەی چاپکردنو ئەو پیتانەی پێی چاپکراون نەك بە منال ناخوێندرێتەوە لە تەمەنی هەشـت نۆ سالآن بەلکو گەورەش ئەبێ لـە گەلیاندا زۆر خۆی ماندوو بکا .

چیرۆکی یەکـەمیان لـە رووی ناوەرۆکیشەوە من بەش بەحالی خۆم نازانم چیرۆکنووس مەبەستی چیە لەم منالە بێدایكو باوکە . یان چۆن لە خۆی رائەبینێ بلێ :

«کەچی ئەم ژیانە پڕ لە چەرمە سەریو کولە مەرگی یە لەلای « ڕێبـاز » زۆر خۆشو بەتام بووەو گەلێ شادمان بوو».

من نازانم دەبێ ژیانی کولە مەرگیو پڕ لە ئازارو ئەندیشە ، دەبێ چـۆن لای منالێکی هەژار بە ژیانێکی خۆش لە قەلەم بدەین ؛ وا بزانم ئەمە ئـەو راستی یەمان بۆ ئاشکرا دەکـا ، چیرۆکنووس خۆی کردۆتە منالو بـۆ خۆی ئەمەی نووسیوە ، جگە لەمـەی



چیرۆکەکە لە ئەنجامیشدا هیچ ناداتـە دەستەوە ، لەوە زیاتر کـە ئەو باوەڕە دەچەسپێنێ لە مێشکی منالآ « خوا لەمە خەراپتر نەدا » . کەواتە دەبێ منالی کورد بە کلۆلیو هەژاری قایل بێ نـەك تووشی خەراپتر ببێ .

لە چیرۆکی دووەمدا لەژێـر ناونیشانی « منالێکی بەناو گووم بوو..» چیرۆکنووس نازانم ئەیەوێ چیرۆك بـە رەمز بۆ منال بنووسێ ؛ وەیان دەبێ منال بەچیی تێبگا کە ئەڵێ :

« دەمەوێ بە فرمێسکەکانم نارەزایی خۆم بەرامبەر بە ژیانی تـالو تفتیو تاریکی تۆ دەربڕمو لەگەل ژانەکانی تۆدا بچمە خوارەوە ..» .

پاشان منالەکە ئەڵێ :

« ـ نازانم بۆ پیاوەکانی ئەم رۆژگارە پیشەیان گریانە ؟

ـ ئایا دەبێ گریان نانو ئاوو ژیـان بێت ؟

ـ ئایا دەبێ گریان دایك بێو لە دایك خۆشەویستتر بێت ؟

دەبگرین .. دەبگرین .. . . . .

گرینۆکەکانی بەردەم تیشکی سێبەری دیوارە رووخاوەکان .. بگرین هەتا ئەو دەمەی بە یەکجاری دەمرن هەر بگرین. بگرین پیاوە گرینۆکەکانی سـەردەمی بێزاری هەتا ئەو دەمەی ئێمە دەبینە هەتاوو خۆمان دەگەیێنینە بەر سێبەری دیواری هەموو مزگەوتو کەنیسـە سووتاوەکان .. »

ئێمە نامانەوێ حوکم لەسەر ئـەم ووشەو رستانە بدەین . ئایا منال لـە تەمەنی شەش حەوت سالآن یـان دە دوانزە سالآن لە ئاخاوتنی وا ئەگەنو ئەم جۆرە فەلـەفانە بە خەرار هـەل دەرێژن . با خوێنەری گەورە لێکیـان بداتەوەو پاشان کارەساتی چـیرۆکی منال بچێژێ .

بەمەندە لە کتێبی چیرۆکی منـالآن « گروگاڵ »ی عباس محمـد حسین دەگوازمەوە بۆ کتێبێکی تری چـیرۆکی منالآن . وە بەرای ئێمـە دوای

خوێندنەوەی گشتی چـــیرۆکەکانی «گروگاڵ» کە دە چیرۆکن ، ئـــەم دە چیرۆکە کـــەلکی منـــاڵان ناداو چیرۆکنووسیش شارەزایی نیە لــــە سروشتی مناڵ .

**(٦) کاروانو ئەستێرە :**

**نووسینی طاهر صالح سعید**
**چیرۆکی مناڵان**

**چاپخانەی کاکەی فـــەللاح**
**سلێمانی ١٩٧٩**

ئەم کتێبە بریتییە لە ( ٥٠ ) لاپەڕە لە قەوارەی ١٧ سم x ٢٤ سم کاروانێ و ئەستێرە دوانزە چیرۆکی کورتی مناڵانە .

لە ڕووی دیمەنو پیتەکانی کە پێی چاپکراوە ، وە لەرووی بەرگەو وێنەکانی ناوەوەی گونجاوە لەگەڵ مناڵو قەوارەی پیتەکانی کە بە بۆڵد چاپکراون کەواتە بە قەوارەی ( ١٨ ) زۆر لەجێی خۆیەتی.
چیرۆکنووس لە چیرۆکی یەکەمـــدا لەژێر ناونیشانی «دارتوو» سەرکەوتوو نیە لە چارەسەر کردنی مەوزوعەکە لــە ڕێگەی « برینەوەی دار تووەکە » چونکی بەلای مناڵەوە زۆر زەحمەتە تێ بگا کــە لەرێگای برینەوەی دارەکەو پاشـــــان هەڵدانەوەی سەر لەنوێ لە ڕەگەوە ، بەم جۆرە دار تووەکە رزگاری ئەبێ .

بەلام لە چیرۆکی « خەرمانو خۆر » زۆر سەرکەوتووە لە زاخاودانی مێشکی مناڵ بە چالاکیو لەش سووکی لەگـەڵ خۆشەویستی خۆر .

لە چیرۆکی « تووتییەکی ژیـــــر » سەرکـــەوتوو نیە لــــە دارشتنی ناوەرۆکەکەی مەبەستی چیرۆکەکە ، زۆر زەحمەتیشە مناڵ سوودی لێ وەربگرێ هەروەها لە چیرۆکی چوارەمی لە ژێـــر ناونیشانی : « کـــاروانو ئەستێرە »ش سەرکەوتوو نیە .

بەلام لە چیرۆکی « قەڵەم » زۆر باش بۆ مەسەلەکە چووە ، هەروەها لــــە چیرۆکی « کوترو پشیلە » .

لە چیرۆکی « چیاو ئاگر » دەربارەی جەژنی نەورۆز شتێکی جوانەو بە باشی بۆی چووە بۆ چەسپاندنی خۆشەویستی ئەم جەژنە لە مێشکی مناڵدا ، بەلام لــە بەکارهێنانی ئەم رستەیە :

« ئەگەر دارم دەست نەکەوێت ، لە جێگەی دار .. بە مەچەکانم .. گڕی ئەو جەژنە پیرۆزە خۆش کـــەم » زۆر سەرکەوتوو نیە ، بەڵکو زیاتر دوای عاتفە کەوتووە یان تەنها ووشەی ریـــــز کردووە .

بەلام لە چیرۆکەکانی تری کتێبەکە ، چیرۆکنووس سەرکەوتووەو چۆتە دڵی مناڵانەوە . چیرۆکەکانی لەو بابەتـــــە چیرۆکانەن لە کاتی خوێندنەوەیان بـــۆ مناڵان لە دەورو پشتت نەبنەوە تـــا چیرۆکەکان تەواو نەکەی ، یان لەکاتی خوێندنەوەیان مناڵ سەری لەســـــەر کتێبەکە هەڵنابڕێ تا تەواویان نەکا ..

**(٧) جوانترین دێ :**

**نووسینی لەتیف هەڵمەت .**

**چیرۆکو هۆنراوە بۆ مناڵان .**
**چاپخانەی ـالحوادثـ بەغدا .**
**١٩٧٩**

کتێبی جوانترین دێ بریتییە لە ٥٣ لاپەڕە بە قەوارەی ١٥سم x ٢٢سم . ئەم کتێبە بریتییە لە چیرۆکی مناڵانو هۆنراوە ، ئێمە لەم تۆژینەوەیە تەنهـا چیرۆکەکانمان مەبەستە ، کە ئەمانەن : « جوانترین دێ ، خۆرێکی گـــەورەو باخچەیەکی فراوان ، نا شەڕی جیهانیی سێیەممان ناوێ ، تەڵێ شقارتە ، بەچکە هەڵۆ ، هاورێتی کانیو دارتوو ، خۆرو دەریا . »

ئێمە لە کتێبی « پەروەردەو مناڵ » لە ساڵی ١٩٨٠ ، ( ٤ ) ، ئەم چیرۆکانەمان شیی کردۆتەوەو لەســـــەر ناوەرۆك بەهاکانی دواوین .

بەگشتی چیرۆکەکانی « جوانترین دێ » چیرۆکی جوانن بۆ مناڵانو بە زمانی مناڵان نووسراوەتەوە ، هەر لەســــــەر نووسینی چیرۆك بە زمانی مناڵو گونجاو لەگەڵ تەمەنو قۆناغەکانی نەشــــــو نەما کردنی جۆراو جۆری مناڵان زیاتــر ئەدوێین بزانین هادی نعمان الهیتی چی دەڵێ :

« .. لەبەر ئەوەی مناڵان پیـــاوی بچووك نیین » بۆیە « کەلتوری مناڵان» گچکە کردنەوە یان هاسانکردنی کەلتوری گشتی نیە لە کۆمەڵدا ، بەڵکو کیانێکی تایبەتی مناڵەو سیمای جیاوازی خۆی هەیە . وە لەبەر ئەمە فێرکردنی مناڵ مانای وانیە گەورەکان هەموو لایەنەکانی کەلتوری گشتی بەشێوەیێکی هەسانکراو بکەیێننە مناڵان ، بەڵکو مانای وایـــە گەورەکان لەو کەلتورە گشـــــتییە پێویستیەکانی مناڵان،ئەوانەی دەگونجین لەگەڵ توانایا نداو وەلامی پێویستیەکانیان دەداتەوە بگـــەیێنن پێیان . تیوری پەروەردەی کۆن وا دەبینێ کەوا میراتی کەلتوری لە خودی خۆیدا زۆر گرنگـــەو پێویستە بەگشتی بگوازرێتەوە بۆ مناڵان بێ دەستکاری لە ناوەرۆکو شـــێوەی گواستنەوەی .. بەلام پەروەردەی نوێ ئەم میراتە وا دەبینێ کەوا ئامانج نیە ، بەڵکو کەرەستەیە ، وە ئامانج لە کردارە پەروەردەییەکان نەشو نەما کردنی تەواو کەرە « المتکامل » بۆ تاك بە پێی تواناو ئامادەبوونی ، وە لە کەرەستەکانی ئـــەم ئامانجە جێبەجێکردنو گەیاندنی کەلتورە بۆ مناڵان ، ئەو کەلتوزەی پێویســــتە لەسەر ڕێبازێکی سایکۆلۆژی گونجـــاو لەگەڵ قۆناغەکانی نەشو نەما کــــردنی

جۆراو جۆر بکونجێن » ( ٦ : ل ١٦ ) .

. وە بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو هەڵەیێکی گەورە ، دەربارەی ناسینی منـــــاڵ پێویستە :

« ئەگەر بمانەوێ هـــەموو لایەنەکانی نەشو نما کردنی زانیاری لای منـــــاڵ شارەزابین ، ..... ئـــەوەی رەوشتی

گەورەش تێبگەین بە تەواوی پێویـــستە پێشەکی رەوشتی مناڵ تێبگەین ، لـــەم رووەوە پیاجێ دەڵێ : « زانینی رەوشتی مناڵ رێگامان بۆ رووناك ئەکاتەوە بــۆ زانینی رەوشتی گەورە . » ( ٧ : ل ٢٢).

**(٨) زێڕینو کاڵێ :**

**نووسینی جمال نوری**

**چیرۆکی منالاَن**

**چاپخانەی ـ دار الحریة ـ بغداد ـ ١٩٨٠**

کتێبی زێڕینو کاڵێ بریتی‌یە لـــــە شەش چیرۆکی کورت بۆ منالاَنو لـــە قەوارەی ( ٩٠ ) لاپەڕەیەو بە پیتی بۆڵد چاپکراوەو لەرووی دیمەنی بەرگەکەیەوە زۆر گونجاوە لەگەڵ منالاَن ، بـــــەلاَم وێنەکانی ناوەوەی بەرەشو ســــپی کێشراوت نەك رەنگاو رەنگ ، ئەگـــەر وێنەکانی رەنگاو رەنگ بوایان زۆر نایابتر ئەبوون .

ناونیشانی چیرۆکەکان : « برسێتی ، دەماڵ دێران کەم بخۆ ، فێڵی رێوی ، جوامێر لەتەك مام وورچدا ، ســـــەر گوزشتەی لالە ئەمە ، زێڕینو کاڵێ . »

هەرچەندە چیرۆکنووس لـــــە تێبینی‌یکدا لە لاپەڕە (٨٩)ی کتێبەکەیدا دەڵێ : « ئەم چیرۆکانە .. گـــــەرچی شێوەی فۆلکلۆری‌یان وەگرتووە بەلاَم من خۆم بە بیری خۆم دورستم کردوون. » من لەو باوەڕەم هەندێ لە چیرۆکەکانی

زۆر کەڵکی لــــە فولکلۆری کوردی وەرگـــرتووە ، وەك چـــــــیرۆکی « سەرگروشتەی لالە ئەمە »یان زێڕینو « کاڵێ » . وە لەچیرۆکی « برسێتی ».

گومان لەوەدا نیـــــە چیرۆکنووس مەسەلەی مام وورچو رێویو گەلێ شتی تری بە منالی بیستووە لــــە فۆلکلۆری کوردیو کاریان تێکردوە ، وە ئەمەش هیچ لە بەهاو نرخی چیرۆکەکانی کـــەم ناکەنەوە . جارێ من بەش بە حـــالی خۆم گەلێ جلر بە منالی گوێم لە مەتەلی مام هۆمەرو رێوی فێلباز بووە بەلاَم بە شێوەیێکی‌تر . یان مەتەلی مـــام وورچ حەبسکردنی لەناو هرارێکی گـــەورەو پاشان کوشتنی .

بەهەرحاڵ هەر شەش چیرۆکەکان لە رووی دیمەنو چاپکردنی بــــە پیتی قەوارەی بۆڵد ، هەروەها لـــە رووی ناوەرۆکەوە زۆر گونجاوون لەگـــــەڵ منالاَن بەتایبەتی لـــە تەمەنی ( ٧ـ١٢ ) سالاَن ، لەبەر ئـــەوەی چیرۆکەکان زۆر کورتە نیینو گەلێ ووشەی گرانیانیش تیایە ، هەرچەندە لەگەڵ تەمەنە زۆر بچووکەکان ناگونجێن بەلاَم لەگـــــەڵ تەمەنەکانی ئاخرو ئۆخری تەمـــەنی ساواکاندا ئەگونجێ . باشتریش وابوو زاراوەی « مۆمی » بەکار نەهینایە لەبەر ئەوەی منالی کورد لە مەوزوعی مۆمو پەیوەندی مۆم بە تەمەنەوە یان جـــەژنی لەدایك بوونەوە تێ ناگا .

بەگشتی « زێڕینو کاڵێ » ئـــــــەم کۆمەلە چیرۆکانە لەو کتێبە باشانەن لە جیهانی چیرۆکی منالاَنی کورد لە سالی ١٩٨٠ چاپکراوە . وە ئەگەر بێتو بـــۆ جاری دووەم چاپکرێنەوەو وێنـــەکانی سەر لەنوێ بە رەنگاو رەنگ چاپکرێنەوە لەگەڵ لادانی هەندێ ووشەی قورس کە کەوتوونەتە ناو هەندێ لە چیرۆکەکانی ، گەلێ سوود بەخشتر دەبێ بۆ منـــالاَنی کورد ، بەتایبەتی کە چیرۆکی باشمان لەم بوارەوا زۆر کەمە .

لەوانەیە هەندێ لە خوێنەرانی بەرێز پرسیار بکەنو بڵێن : ئایا هۆی چیـــە تۆژینەر، داوای چاپکردنەوەی هەندێ لە کتێبەکانی چیرۆکی منالاَن دەکا ، لـــــە کاتێکدا ئەو کتێبـــــانە چـــاپکراونو کەوتوونەتە بازاڕەوە .؟

لە وەلاَمدا دەڵێین ، زۆربەری زۆری ئەم کتێبانەی ئێمە لەسەریان دواوین یان دوو هەزار نوسخەیان لێ‌چاپکراوە یـــان ٥٠٠٠ هەزار . بەهەرحاڵ زۆربـــــەی زۆری کتێبەکانیش لە بازاڕ نەماونو منالیش بە تەبیعەتی حــــــاڵ توانای گەڕانی نیە بە دوای کتێبدا لـــــــــە کتێبخانەکان یان گەڕان بە دوای چیرۆکی منالاَندا لــــــە دوو توێ گۆڤـــارو رۆژنامەکاندا ، بۆیە زۆر پێویـــــــستە ژمارەیێکی زۆر لە کتێبی چــــیرۆکی منالاَن بەڕەنگاو ڕەنگ چاپکرێنو هەمیشە لە بەردەست منالاَنی کورددا بن . ئەو کاتە منالاَن لەکاتی دەســـــت بەتالیان خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێبانە دەبنو هانی خوێندنەوەشیان دەدا .

**(٩) تیتلەو بیبلە :**

**نووسینی : عمر ابراهیم عزیز**

**چیرۆکی منالاَن**

**چاپخانەی ـ علاء ـ بغـداد ١٩٨٠**

کتێبی « تیتلەو بیبلە » بریتی‌یە لە (١٠) چیرۆکی کورتی منـــالاَن . لە ٣٧ لاپەرەی قەوارە ١٧ سم x ٢٤ ســـم چاپکراوەو بەپیتی قـــەوارە ( ١٢ ) . لەرووی دیمەنو وێنەی سەر بەرگەکەیو جۆری چاپکردنی زۆر جوانو نایابن ، هەرچەندە وێنەکانی نـــاوەوەی رەشو سپین .

ئێمە لەم تۆژینەوەیەماندا ئـــەم چیرۆکانەمان خستە لاوەو لەســــەری نەدواوین لەبەر ئەوەی چیرۆکنووس هیچ

دەورێکی نەبووە لە نووسینیان تەنها کۆکردنەوەیان نەبێ لە فولکلۆری کوردی، کە ئەڵێین دەوری نەبووە مەبەستمان لەوە نیە خۆی ماندوو نەکردوە ، یان بەرهەمێکی پێشکەش بە منداڵان نەکردوە، نەء مەبەستمان ئەم لایەنە نیە لە دەورەکە ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە لەرووی ناوەرۆکو بەسەرهاتەکانا کە لە دارشتنی چیرۆکنووسەکە نیە . وە دەبوایا لە سەرەتای کتێبەکەدا نووسەر تێبینێکی بنووسیبایاو بیووتایە ئەم چیرۆکانەم لە فۆلکلۆری کوردی‌یەوە کۆ کردۆتەوە .

### (١٠) پەپوولە :

**نووسینی جزا عەلی ئەمین**
**چیرۆکی منداڵان**

**چاپخانەی المؤسسة العراقیة**
**بغداد - ١٩٨٠**

کتێبی پەپوولە لە قەوارەی ٥ر٢١سم × ٥ر٢٧ سم چاپکراوە وەك قەوارەی گۆڤار بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگەی گونجاو لەگەڵ زەوقی منداڵانو وێنەکانی ناوەوەی چیرۆکەکانیش هەر ڕەنگاو ڕەنگن ، کە بریتین لە ١٣ چیرۆکی کورت لە قەوارەی ٣٦ لاپەرەدا .

چیرۆکی یەکەمیان لەژێر ناونیشانی « گوڵێکی تەنیا »یە، بە پیتی بۆڵدی رەش چاپکراوە . لەم چیرۆکەدا چیرۆکنووس هەوڵیداوە گیانی هاریکاری لە مێشکی منداڵان زاخاو بداو ئەو تاکانەی تەریکنو گیانی هاریکاریان تێدا نیە ئەنجامیان نەمانو فەوتانە .

هەروەها چیرۆکنووس لە چیرۆکەکانی تریش سەرکەوتووە وەك چیرۆکی « ماسی‌یەکی ژیر ، شارە مێرووله ، ڕەگ ، ورگەشین ، چۆلەکە ، تاریکی ، مەلە ، ماسی‌یە گەورە ، گێژ ، بزنە مەرەز ، رەوە کولله ، شمشاڵ . »

بەڕای ئێمە چیرۆکی منداڵان بەم جۆرە بێو لەرووی دیمەنو ناوەرۆکەوە گەلێ خزمەتی منداڵان دەکا .

### (١١) قولە مەیتەر :

**نووسینی عەزیزی مەلا ئەحمەدی رەش**
**چیرۆکی منداڵان**

**چاپخانەی - راپەرین -**
**سلیمانی ١٩٨٠**

کتێبی قولە مەیتەر بریتی‌یە لە ١٢ کورتە چیرۆك لە ٣١ لاپەرەدا بە قەوارەی ١٥ سم × ٢٣ سم . لەسەر کاغزی بۆری رۆژنامە چاپکراوە بە پیتی قەوارە ١٢و لە ناوەوەش چیرۆکەکان وێنەیان بۆ نەکێشراوە . کەواتە بەگشتی کتێبەکە لەرووی دیمەنەوە کەلکی منداڵان نادا . کەواتە با بێینە سەر ناوەرۆکی چیرۆکەکان . چیرۆکی یەکەمیان لەژێر ناونیشانی « راگرتنی سەگی بەرەڵلا زیان بەخشە » چیرۆکنووس هیچ مەبەستێکی ئەوتۆی نەداوەتە دەستەوە، سەرەڕای هەمووی « سەگ » هەمیشە خاوەند وەفایە بەرامبەر خاوەندەکەیو ناگونجێ لە چیرۆکی منداڵان بەم جۆرە رسوا بکرێ . لەگەڵ هەموو کەمو کوڕیێکی چیرۆکەکەش کۆمەڵێ وشەی ناوچەیی لاوازی بەکار هێناوە وەك : «لەغەر ، بركۆكەك ، هێکەوە » .

لە چیرۆکی دووەمیش لە ژێر ناونیشانی « ترس یەکێتی پەیدا دەکات» هەمیسان سەرکەوتوو نیە ، تا لە ناونانی پاڵەوانەکانی ، بەتایبەتی « گورگ » لای منالی کورد وا نەناسراوە کە ئەوەندە ترسنۆك بێ کەلاك بۆ سەگ بە جێبهێڵێ لەو دەشتە ، لە لایەکی ترەوە چیرۆکەکە ئامانجێکی ئەوتۆ ناداتە دەست منالەوە .

چیرۆکەکانی تری : «مۆری تەبێ بوون، من ناوم » هەروەها « ئەنجامی زۆر دارێتی » زۆر لاوازو بێ کەلکن . خۆ چیرۆکی « مەرجە » گومانی تێدا نیە کەوا لە فولکلۆری کوردی‌یەوە وەرگیراوە .

بەڵام لە چیرۆکی « هانا » چیرۆکنووس مێشکی منداڵان بە بەهای هاریکاری زاخاو ئەداو سەرکەوتووە لە نووسینەکەیدا . هەرچەندە لە وشەی ناوچەیی رزگاری نەبووە .

بەگشتی چیرۆکەکانی تری زۆر بێ کەلکنو ناشێن ناویان لێبنێین چیرۆکی منداڵان . هەر وەکو لە سەرەتای ئەم توێژینەوەیەماندا ووتوومانە : « هەر یەکێ هەڵسێو دەست بداتە پێنووسو چەند لاپەرەیێك رەش‌کاتەوەو ناوی بنا چیرۆکی منداڵان ،وا بزانین بەرەو هەڵدێرێکی خەراپمان ئەبەن..» ئەم جۆرە چیرۆکانەش لەو جۆرە بابەتانەن .

پاشان لە کۆتایی کتێبەکە چاومان بە چوار لاپەرە دەکەوێ تەرخان کراون بۆ راست کردنەوەی هەڵەکانی کتێبەکەو ئێمەو ( ٨٠ ) هەشتا ووشەی هەڵە لە (٣١) لاپەرەدا .

### (١٢) ئەستێرە :

**نووسینی عباس محمد حسین**
**چیرۆکی منداڵان**

**چاپخانەی - الحوادث -**
**بەغدا ١٩٨٠**

ئەم کتێبە کتێبی دووەمی چیرۆکنووسە لەبابەت چیرۆکی منداڵانەوە. کتێبی یەکەمیان « گروگاڵ » لە ساڵی ١٩٧٩ چاپکراوەو لەم توێژینەوەیەماندا لەسەری دواوین .

کتێبی ئەستێرە بریتی‌یە لە ( ٥٠ )

لاپەرە لە قەوارەی ٥ر١٤×٢٠ سم . ناوەرۆکەکەی (١٠) چیرۆکی کورتە . ئەم کتێبەیان لەرووی دیمەنەوە سەرکەوتووەو بەپیتی بۆلد چاپکراوەو وێنەکانی ناوەوەی کتێبەکە ڕەنگاو ڕەنگ نیە بەلام گونجاوون لەگەڵ ناوەرۆکی چیرۆکەکان .

•

ئەوەی جێگای داخە چیرۆکنووس لە پێشەکی کتێبەکەی لە ژێر ناونیشانی « یەك .. دوو .. ووشە »نووسیوەتی: « بۆ دارشتنەوەیان راستەوخۆ لە تێکڕای ژیانی شێوەی ئەم رۆژگارە سوودم وەرگرتووەو کردوومنەتە ئاوێنەی ڕەنگ دانەوەی ژیانتانو بایی تۆزقالێك قەرزاری کەس نیمو چاوێشم لەکەس نەکردووە .. هتد » .

وا دیارە نووسەر زۆر لەخۆی بایی‌یەو قەرزاری کەس نیە ، تەنانەت قەرزاری ئەو مامۆستایانەش نیە کە فێری خوێندنو نووسینیان کردوە . یان قەرزاری ئەو مامۆستایەش نیە کە لە یەکێ لە چیرۆکەکانی لەژێر ناونیشانی « سەر لەشکرو مێروولەیەك » گوایا ئەم چیرۆکە لە مامۆستاکەی بیستووە ، وابزانم لە کۆمەڵە چیرۆکەکانیش هەر ئەم چیرۆکەیان بەکەلکە .

دووبارە بەگشتی چیرۆکنووس سەرکەوتوو نیە لەم کتێبەشی هەرچەندە هەندێ پێشکەوتنی پێوە دیارە . بۆیە بەم چەند سەرنجانە کۆتایی بە کتێبی « ئەستێرە » دێنین . ئەو چیرۆکانەی لە فۆلکلۆری کوردی‌یەوە وەریانی گرتووە جێگای ئەم باسە نیە . خۆ چیرۆکی« فیلە گەورەو شارە مێروولە»ش هەر لە فۆلکلۆری کوردی‌یەوە وەریانی گرتووە ، ئەگەر بیرم تیژ بێ وابزانم ئەم چیرۆکەی دوایم بە زمانی عەرەبی خوێندۆتەوە .
لە چیرۆکی« زۆران بازیی شێرو بەراز » بەتەواوی مەبەستی پێچەوانەی داوەتە دەستەوە ، لەبەر ئەوەی لە سەرەتای چیرۆکەکە شێرەکەی بە پەلاماردار لە قەڵەم داوەو لە کۆتاییشدا

هەر شێرەکە بە سەرکەوتوو ئەناسێنێ بە منالانو منالانی شێرەکە بە بەختەوەری دەژینو لەشکری بەرازان تەرتەو وەرتە دەبن .

**(١٣) ئارەزوو :**

**نووسینی : سروە نوری دزەیی‌و**
**مەریوان نوری دزەیی**
**کۆمەڵێ وتارو شیعرو**
**چیرۆکی منالان**
**چاپخانەی ــ الحوادث ــ بەغدا**
**١٩٨٠**

کتێبی ئارەزوو بریتی‌یە لە (٣٠) لاپەرە بە قەوارەی ٥ر١٤سم × ٥ر٢٤ سم . ئەوەی بەلای ئەم تۆژینەوەیە مەبەستە چیرۆکەکانی ئەم کتێبەیە نەك شیعرو وتارەکان . چیرۆکەکانیش بریتین لە:

« چیرۆکی تۆلە ، ئاکۆو ئاسۆ، دوبرا، قوتابی‌یەکی هەژار ، » لەم چوار چیرۆکەش چیرۆکی ، دووبرا، چیرۆکێکی فۆلکلۆری‌یە ئەم چیرۆکەش ئێمە لەسەری نادوێین .

کتێبی ئارەزوو لەرووی دیمەنو ئەو پیتانەی پێی چاپکراوە بە قەوارەی بۆلد لەگەڵ تەمەنەکانی منالان دەگونجێنو چیرۆکەکانیش بێ وێنەن ، کەواتە وێنەیان بۆ نەکراوە لەناوەوەی کتێبەکە.

چیرۆکی یەکەم « چیرۆکی تۆلە» بەرای ئێمە ئەم چیرۆکە لە دارشتنی دوو منالی تەمەن ١٣ سالانو ١١ سالان نیە ،هەروەك لەسەر لاپەرە ٣ی کتێبەکە تەمەنی سروە بە ١٣ سالانو مەریوانیش بە ١١سالان دیاری کراوە . دوور نیە چیرۆکەکەیان وەك مەتەڵ گوێ لێ بووبێ‌و پاشان بۆیانیان نوسیبێتەوەو کەسو کاری ئەم دوو منالە مەبەستیان بووە منالەکانیان هەر لەمنالیەوە بینە شاعیرو نووسەرو چیرۆکنووس هەرسێ بابەتەکەش پێکەوە . گومان لەوەدا نیە مەسەلەی داوێن پیسی‌و تێکەیشتنی بێ‌شەرەفی‌و گەلێ بەهای تر لەناو چیرۆکەکە » سەرەرای ئەمەش هەردوو چیرۆکنووس ئەگەر راست‌بێ خاوەنی چیرۆکەکەبن ، لە دارشتنیا سەرکەوتوو نین .

لە چیرۆکی « ئاکۆو ئاسۆ » دەربارەی دوو هاورێی قوتابیە، یەکێکیان زیرەكو ئەوی تریان تەوەل . زۆر ئەشێ ئەم چیرۆکەیان نووسینی خۆیان بێ . ئەم چیرۆکە هەرچەندە زۆر کورتە بەلام بەهای زیرەکی‌و خوێندنی باش لە قوتابخانە زاخاو وەدا لە مێشکی منالان .

چیرۆکی « قوتابی‌یەکی هەژار » ئەم [illegible] وسینی خۆیان بێ ، [illegible] ۆکەش لەسەر [illegible] یەو بەهای هاریکاری [illegible] اخاو وەدا .

[illegible] نین ناوی ئەم کتێبە بنێین کتێبی [illegible] ۆکی منالان لەبەر ئەو هۆیانەی لەسەرەتاوە دەست نیشانمان کردووە .

بەهەرحاڵ کتێبەکە چیرۆکی یەکەمیانو چیرۆکە فۆلکلۆریەکەی نەبوایاو لە جیاتی ئەو دوو چیرۆکە چەند چیرۆکێکی کورتی لە مستوای تەمەنی هەردوو چیرۆکنووسەکە بوایا لەوانەیە ئەم بۆچوونەی ئێمەی بگۆڕیبایا .

**(١٤) وریابن خەوتان لێ نەکەوێ :**

**نووسینی مەلوود ئیبراهیم حەسەن**
**چیرۆکی مێر منالان**
**چاپخانەی ــ الحوادث ــ بەغدا**
**١٩٨١**

کتێبی وریابن خەوتان لێ نەکەوێ

بریتی‌یە لە ٦٢ لاپەرە بە قەوارەی ١٤سم × ٢١سم و چیرۆکەکانیشی بەپیتی بوڵد چاپکراون کە بریتین لە شەش کورتە چیرۆك . وێنەکانی ناوەوەی کتێبەکە هیچ پەیوەندێکیان نیە بە چیرۆکەکانەوەو ربایا هەر نەبوونایا . جۆری نووسینی چیرۆکەکان شێوەی ناوچەییان زۆر بە زەقی پێوە دیارە، بە تایبەتی لەرووی بەکارهێنانی ووشەکانیەوە .

دەربارەی چیرۆکەکان گوایا وەك چیرۆکنووس لەسەر لاپەرەی یەکەمی کتێبەکەو لەسەر بەرگەکەی نووسیویەتی بۆ « مێر منالآنە » بەلآم لەراستیدا بۆ منالآنە لە تەمەنی شەش حەوت سالآن تا ئەگا بە ١٢ سالآن نەك تەنها بۆ مێر منالآن .

چیرۆکی یەکەم « کۆترێکی مالی » لە رووی ناوەرۆکەوە چیرۆکنووس سەرکەوتووە لە دارشتنەکەی. بەتایبەتی مێشکی منالآن زاخاو وەدا بە بیرو باوەڕی ئازادیو پەنا بردنە بەر خود هەرچەندە چیرۆکنووس هەندێ لە ناوەرۆکی چیرۆکەکەی لە فۆلکلۆری کوردی‌یەوە وەرگرتووە یان فۆلکلۆرەکان لە منالیەوە لە « لا شعور »ی کۆبوونەتەوەو لەکاتی نووسینی چیرۆکەکە پەڕیونەتەوە بۆ بواری هەستکردنی‌و باسی ئەوەی نەکردووە ، خۆ ئەگەر باسی بکردایا بەرای ئێمە هیچی کەم نەئەکردەوە لە نرخی چیرۆکەکە .

چیرۆکی دووەم لە ژێر ناونیشانی « ئاوەدانی » چیرۆکنووس هەولیداوە بەهای یەکێتی بچەسپێنی لە مێشکی منالآن ، بەلآم بە شێوەیەکی ئەوتۆ بە باوەڕی ئێمە زۆر هاسان‌نیە ، پاشان تەنها بە بەکارهێنانی ووشەی « بژی یەکێتی » باوەڕی یەکێتی ناچەسپێ لە مێشکی منالآندا .

لە چیرۆکەکانی تری وەك « ئەنجامی دەمچەفتی وە وریا بن .. خەوتان لێ نەکەوێ » لە یەکەمیاندا بەهای کارکردن‌و کۆکردنەوەی زەخیرە بۆ دوارۆژو وەرزی زستان فێری منالآن دەکا ، بەلآم لە چیرۆکی دووەمدا لە فۆلکلۆری کوردی‌یەوە وەرگیراوە . فۆلکلۆرەکەش بە ووشەی زەقی وەك « کراشێکی» یان بە بەکار هێنانی ووشەی « کۆمەلە کارو بەرخێکی » لە جیاتی برگە یان مێگەلە یان « گەلە بەرخێکی » چونکە کوردەاری ووشەی « کۆمەلە » بۆ مەڕو ئاژەڵ بەکار ناهێنێ ، لە گەرمیان دەلێن « بەرخەلەکەو کارگەلەکەو مێگەلە مەڕەکە » یان بەکارهێنانی هەندێ ووشەو رەستە کە منالی کورد زۆر زەحمەتە لێیان تێ بگا وەك : «سوێندت دەخوارد وردە ئەلماسیان لەو ناوەی تۆداوە » ئەبێ منالی کورد چۆن لە ووردە ئەلماس تێ بگا . خۆ زۆر ئاسان بوو چیرۆکنووس ووشەی خۆمالی گەلێ لەووردە ئەلماس جوانتری بەکار بهێنایا بۆ منال کوردو وەیا بزانین گورانی کورد چی دەلێ :

« کانی‌یەکی روونی بەر تریفەی مانگە شەو :

لەبنیا بلەرزێ مرواریی زیخ‌وچەو. »
( ٨ : ل ٤٦ )

لێرە دەبینین « زیخ‌وچەو » چەند جوان بەکار هێنراوە لای شاعیری گەورەی کورد عبدالله گۆران‌و چۆن ووشەی کوردی رەسەنی لەبەر دەست وەك قوڕی صناعی نەرم‌و نۆڵ بووە ، ئنجا چیرۆکنووس چی‌داوە لە ووشەی رەقی بێگانە وەك ئەلماس .

چیرۆکی « جریوەیەکی پەرەسێلکەکان» لەبەر ئەوەی لە فۆلکلۆرەوە وەرگیراوە ئەوا لێرە لەسەری نادوێین .

بەگشتی بەرای ئێمە چیرۆکنووس لەم کۆمەلە چیرۆکانە خزمەتی منالآنی کوردی کردووە .


## سەرچاوەکان

١ ـ موحازەرەکانی دکتور نوری جعفر لە کۆلێجی پەروەردە ـ زانستگای بەغدا ، دراساتی بالآی دکتورا سالی ١٩٨٢ ، چاپ نەکراوە .

2 - Simth, Madorah. E., “An investigation of the Develop - ment of the sentence and the Extent of vocabulary in young children, 1926.

ـ کامل ثامر الکبیسی ، المحصول اللفظی للاطفال المبتدئین فی‌الصف الاول الابتدائی . رسالة ماجستیر ١٩٧٩ . کلیة التربیه ـ جامعة بغداد .

٤ ـ عبدالستار طاهر شریف . پەروەردەو منداڵ .

٥ ـ مصطفی صالح کەریم . نووسەری کورد ژمارە (٣) خولی دووەم ١٩٨٠

٦ ـ هادی نعمان الهیتی : صحافة الاطفال فی العراق ، نشأتها وتطورها مع تحلیل لمحتواها وتقییمها . دار الرشید للنشر ، بغداد ١٩٧٩ .

٧ ـ عبدالستار طاهر شریف : نەشو نەما کردنی زانیاری لای منال ، دار العراق للنشر والطبع ، بەغدا ، ١٩٨٢ .

٨ ـ محمدی مەلا کەریم : سەرجەمی بەرهەمی گۆران بەرگی یەکەم ـ دیوانی گوران محمدی مەلا کەریم کۆی کردوتەوە .

چاپخانەی کوڕی زانیاری ـبەغدا، ١٩٨٠ .

کەریم شارەزا

# هونەری شاعیرێکی نەتەوەیی کورد

شاعیر هونەرمەندێکی بەهرەداری خاوەن هەستێکی ناسكو سۆزو ئەندێشەیێکی قووڵە ، بەشێکی جودا نەکراوەیە لە ژیانە تایبەتی یەکەی خۆیو ژیانی ئەو چینو توێژەی تێیدا دەژیو، بەندە بەو خاكو ئاووهەواو دەورو بەرەی کە تێیدا پەروەردە دەبێ . .

شاعیر هونەرمەندێکە بەر لە هەموو کەسێکی دیکەی کۆمەڵەکەی کارەساتی نیشتمانو گەلەکەی کاری تێدەکاو دەیهەژێنێو موچرکی هوشیار بوونەوەی بەمێشكو هۆشیدا دەهێنێو ، دوای هەموو کەسێکیش بۆ ئازادیو بەختیاری میللەتەکەی پێدەکەنێ .

شاعیر لە ناخۆشیو شادیی میللەتەکەیدا بەشدارەو وەفاداری خاکی نیشتمانەکەیەتیو ، لە ئەنجامی موعاناتو ژانو ژواری دەروونی بەرامبەر بە رووداوی کاریگەری ناو کۆمەڵگاکەیدا هۆنراوەیەکی لەلا سەر هەڵدەدا و دەخولقێ .

بۆ زانینی سەرکەوتنو سەرنەکەوتنی ئەو بەرهەمە شیعرییەشی بە پێی بیرو ڕای رەخنەگرانی ئەدەبی هاوچەرخمان دەخرێتە بەر تیشکی رووناکی ئەم خاڵانەی خوارەوە :ـ

**١ ـ ئایا هونەری شاعیرەکە لە بارەی سۆزەوە چۆنە ؟ ئایا سۆزو هەستەکەی ناسكو ڕاستگۆیانەن؟ یاخود لاوازو بێهێزو پێزن؟ ئایا بەدو ناهەموارو نزمن یان پاكو جوامێرانەن ؟!**

**٢ ـ ئایا ناوەڕۆكو مانای بەرهەمەکە راستو تەواون ؟ یان هەڵەو چەوتو چەوێڵن ؟ ئایا تەنکاوو رووکەشن یاخود قووڵو پتەون ؟! ئایا داهێنانێکی نوێیان تێدا بەدی دەکرێ ؟ یاخود هەر جوینەوەی پێشووو گوتنەوەی بەرهەمو داهێنانی شاعیری پێش خۆیانن ؟**

**٣ ـ ئایا ئەندیشەی شاعیر قووڵو ناسکەو هەستی خوێنەر یان گوێگر دەجوولێنێو بۆلای خۆی رادەکێشێ ؟ یاخود تەنها دیاردەیەکی ئاسایی بێ پێتو تەنکاوە ؟!**

**٤ ـ ئایا شاعیر بەرگێکی جوانی لە ووشەو دەربڕینی ناسکی بە بەر ماناکانی دا کردووە ؟ ئایا لەسەر شێوەی ئەدیبێکی پێش خۆی رۆیشتوە یان ریگاییێکی تازەی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە ؟**

له دوا جاردا ، ئایا جێگەو پایەی شێوە تایبەتی‌یەکەی له ناو هونەرو چەشەی ئەدەبی‌و ڕەوانبێژی‌و زانستی زماندا چۆن خۆیان دەنوێنن ؟ ! ئایا توانیویانە شوێنێکی دیاری کراو لەناو شێوەی شاعیرانی دیکەی نەتەوەی کورددا بۆ خۆیان بکەنەوە یان نا ؟!

ئینجا ئێستا بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە خستمانە ڕوو ، با ژیان‌و بەرهەمی شیعری شاعیری نەتەوەیی کورد « عەونی » بخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی ئەدەبی ، تا بزانین تاکو چ ڕادەیەك شیعرەکانی ئەم شاعیرە دەنگ ناسکە جێی خۆیان لە ناو شیعری ڕەسەنی نەتەوەیی کوردماندا کردۆتەوە ؟

## چاو پێداخشانێکی خێرا بە تۆماری ژیانی « عەونی »ی شاعیردا :ـ

عەونی نازناوی شیعریی نەتەوەیی کورد [ عوسمانی کوڕی حەبیبی کوڕی عەبدوللا ] یە ، لە ساڵی ١٩١٤ دا لە گەڕەکی بەفریقەندی کۆیەی ، شاری حاجی قادری کۆیی‌و حاجی مەلا عەبدوللای جەلی‌زادەو ئەختەری شاعیرو مەنفی‌و مەلای گەورەدا لە دایك بووە ، لە ساڵی خوێندنی [ ١٩٢٧ ـ ١٩٢٨] چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی کۆیەو تا پۆلی پێنجەمی خوێندووە . ماوەیەکیش لە مزگەوتی [ حەتك ] لەلای مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەودالانی‌ی ناودار بە «دلاوەر »ی شاعیر هەندێ دەرسی ئایینی وەك ( العقائد ) و ( الشرع ) و هەروەها [ قواعد اللغه العربیه ]ی لەلا خوێندوە . ئینجا بۆ ماوەی ساڵ‌و نیوێك زمانی فارسی لەلای [ مەلا ئەحمەدی ڕەش ] خوێندووە، لەو کاتەدا باوکی کۆچی دوایی دەکات‌و ناچار بۆ گوزەران‌و بەڕێوەبردنی ماڵی باوکی لە جێی ئەو دووکانی بەقاڵی‌یەکەی بەڕێوە دەبات‌و دەکەوێتە سەر کاسبیی خۆی .

کە دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە برادەرە دڵسۆزەکانی وەکوو [ میرزا عەبدولکەریم ] و ( محەمەد حەوێز ) ی ناسراو بە ( حەمە ڕەش ) کتێبەکانی خوێندنی پۆلی شەشەمیان پێ لەبەر کردووە . وەك خۆی لە یادداشتە دەستنووسەکانی‌دا دەڵێ :ـ «کە لە قوتابخانە بووم هەندێ مامۆستای کوردپەروەری وەکوو [ صالح قەفتان‌و عەلی ئاگاو عەبدوللا عەزیزو ڕەمزی ڕەحیم ( مامەند کەرکووکی )و خالید سەعید ] دەورێکی بالایان بووە لە مێشك ڕوون کردنەوەم و بلاو کردنەوەی بیرو هەستی کوردایەتی بە ناو قوتابیاندا »(١) .



عەونی لە ڕێگەی هەوڵی بەردەوام‌و خۆ فێرکردنەوە توانیویەتی بە چاکی زمانەکانی [ کوردی‌و عارەبی‌و فارسی ] فێرببێ‌و خۆی پێ‌بکەیێنێ .

عەونی لە ساڵی ١٩٤٠دا ژنی هێناوەو منداڵی لە کوڕو لە کچ زۆرەو ( تەمەنی‌خۆی‌و منداڵەکانی درێژبێ )و لە ساڵی ( ١٩٤١ )وە کەوتووەتە سەر ڕێبازی سیاسی‌و ئەندامێکی چالاکی ( حیزبی هیوا ) بووەو ، دوا بە دوای ئەویش لە جووڵانەوەی نیشتمانی دانەبڕاوەو لەسەر هەڵوێستە سیاسی‌یەکانی گەلێ تووشی ئەشکەنجەو ئازاربووەو گەلێ جار گیراوەو هەندێ جاریش دوور خراوەتەوە بۆ خواروی عیراق .

وەك ئەدیبێکی ناسراوی کورد بەشداریی لە کۆنگرەکانی یەکەم‌و دووەمی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە کردووە ، کە لە ساڵانی ١٩٥٩و ١٩٦٠ بەستراون‌و ، لە ساڵی ١٩٧٠داو لەگەڵ دامەزرانی یەکێتی نووسەرانی کورد ، بووە بە ئەندام لەو یەکێتی‌یەو لە دوای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کوردیشەوە بە ئەندامی یاریدەری ئەو کۆڕە وەرگیراوە .

ئێستا لە کۆیە دوکانەکەی بووە بە یانەی ئەدیبانی ئەو شارەو هەموو ڕۆژێك دەستەیێك لە نووسەر و شاعیرو ڕۆشنبیران لەلای کۆدەبنەوەو لە شیعرو ئەدەبیات‌و مەسەلەی ڕۆشنبیریی یەوە دەدوێن .

**عەونیو شیعر : ــ**

عەونی وەك خۆی لە یادداشتەکانیدا دەڵێ : « شیعرە بەرزە کانی ( نالی )ی نەمر کە بە دەستنووس لە کۆیە چنگ دەکەوتنمیان کرد بە شاعیرو لە سەرەتادا ڕێبازی شیعری دڵداریم گرتەبەرو ، لە دواییدا خوێندەواریم بە هێزبوو ( کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی )ی چاپو بڵاوکردنەوەی ( ئاوڕەحمان سەعید )م کەوتە دەستو بە ووردی خوێندمەوە تامو چێژێکی زۆرم لە غەزەلو شیعرە نەتەوەیی‌یە کانی وەرگرت ، ئەمە لە لایێكو هاتنی کوردە دەربەدەرەکانی کوردستانی تورکیا بۆ عێراقو بڵاوبوونەوەی ژنو منداڵەکانیان بەناو شارە کوردی‌یەکاندا ، ئەمەش دوای کوژاندنەوەی شورشەکەی (شێخ سەعیدی پیران) بوو ،ئێمەی هەرزەکارو گەنج ئەو کارەساتە زۆر کاری تێ دەکردین . من تا ناوەڕاستی سی‌یەکانیش ئەو کارەساتە لە مێشكو دەروونمدا جۆشی دەسەندو بەرەو شیعری نەتەوەییان دەبردم ،بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەستم لە شیعری دڵداریو هونەرەکەی نالی بەر نەدا . »(٢).

عەونی هەرچەندە لە چینو توێژێکی کاسبکار سەری هەڵداوە ، بەڵام لە ئەنجامی کەسابەتی خۆی بووە بە بازرگانی تووتنو ڕەنگدانەوەی ئەم جۆرە ژیانە تازەیە وای لێکردووە چ لە ڕێبازی شیعری‌و چ لە ڕێبازی سیاسی‌دا بە زۆری هەر خەتە نەتەوەییەکەی کوردایەتی بگرێو ئەمەش هەڵوێستێکی ڕاستگۆیانەیە لە گەڵ خودی خۆیدا نواندویەتی‌و تائێستا لێی لا نادات .

عەونی هەرچەندە لە ساڵی ١٩٣٢ وەوە شیعری ئۆپەریتی بۆ قوتابیانی قوتابخانە سەرەتاییەکەی کۆیە داناوەو لە سەر شانۆ پێشکەش کراوەو ، ناوەرۆکەکەی هەستێکی نەتەوایەتی کوردی بووە .(٣) بەڵام لە ساڵی ١٩٣٥دا بەتەواوی دەستیی شاعیریی بەهێز بووەو وەك قوتابیەکی زیرەکی قوتابخانە شیعرەی‌یەکەی (نالی) دەستی داوەتە شیعری (غەزەل) دانانو بە جوانی لێی سەرکەوتووە .

ئێمە نا توانین سنوورێکی زەمەنی لە نێوانی شیعری دڵداری‌و شیعری نەتەوەیی لەلای عەونی دابنێین ،چونکە وەك سەرنج دەدەین ، ڕێبازی شیعری دڵداری‌و ڕێبازی شیعری نەتەوەیی لەلای ئەم شاعیرەمان وەك دوو هێڵی تەریبی لەگەڵ یەکدا درێژ بوونەتەوە ، واتا :لەو کاتەیەوە شیعری سیاسی داناوە ،دەستی لە شیعری دڵداری‌و وەسفی جوانی ئافرەت هەڵنەگرتووە .

**عەونیو شیعری دڵداری :ــ**

عەونی وەك خۆی دەڵی لە سەرتای شاعیریەتی‌دا شیعرە نایابەکانی (نالی بەڕادەی یەکەمو مستەفا بەگی کوردی‌و وەفایی بە ڕادەی دووەمو سێیەم بەرەو دنیای شیعرو غەزەلی کوردیان بردم .

با سەرنجێك لە هۆنراوەیەکی کۆنی ئەم شاعیرەمان بدەین تاکو بزانین تا چ رادەیەك گەوهەری وردەکاری لە دەریای شیعرەکانی ئەو شاعیرە گەورەیەی کورد هەڵێنجاوەو چۆن وەستایانە لە غەزەلەکانیدا بە کاری هێناوە ،هەروەك دەڵێ :ــ

**لەم کولبەیی ئەحزانە عەشقی صەنەمێکم بوو**
**لەم چۆڵو بیابانە باخی ئیرەمێکم بوو**

**ئەی دڵ بەخەتا تاکەی مایل بە خەتاکاریی ؟**
**دوێنێکە دەمێکم بوو ،ئەمرۆ نەدەمێکم بوو(٤)**

ئەگەر بەکەمێك وردبوونە سەیری دێری دووەمی شیعرەکەی بکەین ، دەبینین بە ئاشکرا تارمایی شاعیریەتی نالی بە سەرەوەیە هەروەکو ئەو دەیەوێ یاری بە ووشەی شیعریی بکاتو وردەکاریی ڕەوانبێژی بنوێنی ،هەروەك لە نێوانی ووشەکانی (دەمێکم)و (نەدەمێکم) دا کردوویەتی‌و جۆرە (ڕەگەزدۆزی) یەکی پێکەوە ناوەو چونکە ووشەی (دەمێکم) مانای (کاتێکە) یا (سەردەمێکم) دەداتو (نەدەمێکم) یش مانای پەشیمانی دەداتو خۆی لەم تاکە شیعرەی (نالی) نزیك دەکاتەوە کە دەڵێ :ــ

**دوێنێ چ بو دەتدا بە زوبان لافی کەرامەت**
**ئەمرۆ نەدەمت بوو ، نەدەمت بوو ،نەدەمت بوو(٥)**

عەونی دوای ئەم سەرتایە سەرکەوتووە ، لە سەرهەمان تامو بۆی شیعرەکانی نالی چەند دێرێکی دیکەمان پێشکەش دەکاتو دەڵێ :ــ

**بێ هەمدەمو هەمتامە ،بۆ خلوەتی تەنیایی**
**بۆ مونیسی ئەحزانی گوڵ غونچە دەمێکم بوو**

**ئاخر فەلەکی بەدکار دووچاری غەمی کردم**
**جارێ لە خەوا وەصلی لەب جامی جەمێکم بوو**

بەر لەوەی کوردەکانی کوردستانی تورکیا لە دوای ساڵی ١٩٢٥دا دەر بە دەر بنو بێن بۆ عیراق ،کوردەکانی

کۆمەڵەکەمان ئالوودەی هێڵێکی سیاسیی روون بوو کە ئەمانەی ئەنواند : « پێویستە لەژیانی رۆژانەی سەختی گەلدا لەگەڵ میللەت بین» ، « لەسەر لاپەڕەی کتێبەکانمان ئەو بارودۆخە روون بکەینەوە » .

بەرهەمەکانم لە سلڤادۆرو هەندێ وڵاتی ئەمریکای لاتین‌و لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هەروەها لە ئەورووپاشدا چاپ‌و بڵاوکراونەتەوە .

**ــ پرسیار : پاڵەوانی هۆنراوەکانت کێن ؟**

ــ وەڵام : پاڵەوانی هۆنراوەکانم میللەت خۆیەتی، بێ‌گومان هەندێ کەس‌و نموونەی تر هەن کە لەئەفسانەوە وەردەگیرێن یاخود نۆینەری قووتابخانەیەکی ئەدەبین، بەڵام من پاڵەوانی خۆم کە میللەتە لە پێشتی دادەنێم، ئەو پاڵەوانەی کە باشترین سیمای دروست بوونی میللیی تێدا کۆبۆتەوە، لەبەر ئەوە مێژووشم بەلاوە گەلێ گرنگە، لەبەر ئەوە دەربارەی کاری جەماوەری میللی لەخەباتیاندا لەپێناوی دواڕۆژێکی داد پەروەرانەو سەربەستدا دەدوێم، بۆیە مرۆڤی پاشەڕۆژ دەبێتە پاڵەوان، ئەو مرۆڤەی کەووتەو کردەوەی یەك دەخاو هیوای بەخەباتی میللەتەکەی هەیە .

**ــ پرسیار : گرنگترین ڕێڕەوە بنچینەیی‌یەکانی شیعری هاوچەرخی سەلڤادۆری کامانەن ؟**

ــ وەڵام : شیعری سلڤادۆری هاوچەرخ یەك ڕێڕەوی گرتۆتە خۆی ئەویش : « ریالیزمی رەخنەیی » یە، ئەمەش بەزۆری لە شیعرەکانی فرانسیسکۆ دیاس‌و رافائیل ئەلفارس کاسترۆو ئەنتۆنیۆسافی‌و فرانسیسکۆگافیلدیادا دەردەکەوێ . شیعری سلڤادۆری بەگشتی لەخزمەتی شۆڕشی سلڤادۆر دایەو، کاری شۆڕشی کوباو تاقیکردنەوەی شۆڕشگێڕەکانی ئەمریکای لاتینیشی لەسەر دیارە .

کۆمەڵە ئەدیبێکی تر هەن کە شایانی باسە لێرەدا ناویان بهێنرێ، ئەوانیش کۆمەڵی «بەردو سەدە»یان ناوەو لە ساڵی ١٩٦٦دا پێكهاتن، بریتی بوون لە:

خوسیە ماریاکویلیا، رافائیل مندۆزا ، ئوریل ڤلنیسیاو هی تر .. ئەم کۆمەڵەیە لە هەموو ڕێڕەوە سیاسی‌یەکانی تێدا بوو، هەروەها دەمەوێ ناوی هەندێ لەو شاعیرە لاوانە بهێنم کە دەنگێکی باشیان لەناو گەلی سەلڤادۆردا پەیداکرد وەکو : ماورسێومارکینۆ، نیکۆبێرتو گونگورا، رابسا فلبیرتۆ، ریفالۆ، ئەلفۆنسۆ ئەرناندس .

لەگەڵ ئەوەشدا، بەداخەوە، ئەدەبی سلڤادۆری لەجیهاندا هەر بە ناسراوی ماوەتەوە . زۆرجار، پێشکەوتنی ئەدەبی سلڤادۆری، تووشی گیروگرفتی وا دەبێ کە بەگران چارەسەری بۆ دەدۆزرێتەوە، گرنگترینی هۆیەکانیشی : نەخوێندەواری‌یە کە زۆربەی وڵاتی گرتۆتەوە، هەروەها هەژاری ، گوێ‌نەدانی میری بەپەرەسەندنی رۆشنبیری، یارمەتی نەدانی رۆشنبیرە داهێنەرەکان، بۆیە دەبینین زۆربەی ئەدیبەکانمان لە دەرەوەی وڵات زۆرتر دەناسرێن وەك لەناوەوەی وڵات .

**ــ پرسیار : شتێکمان دەربارەی مەسەلەکەت ( شیعری « بژی قووتابیان » ) بۆ بڵێ ؟**

ــ وەڵام : لە خەباتی شۆڕشگێڕانەدا ، زۆربەی قووتابیان، لەو وڵاتانەی کە خەبات لەپێناوی سەربەخۆیی‌دا دەگێڕن ، ریزی پێشەوە دەگرن ،لەو لاوە خوێن‌گەرمانەدا هێزێکی زۆر هەیە کە گوزارشت لەگرنگیی مێژووی نەتەوەیی دەکا .

کە بەم جۆرە قسە دەکەم ، بەر لە هەرچی بیر لەو دەورە پاڵەوانەیەی قووتابیانی سلڤادۆر دەکەمەوە کە ئێستا دەیگێڕن، لە حەفتاکاندا ڕێکخراوە قووتابیەکان پەیوەندی‌یان لەگەڵ هێزی شۆڕشگێڕی سلڤادۆردا بەهێز کرد ، ئەمەش لەبارو دۆخێکی وادا هاتەکایەوە ، کە هەر هەموو ، خەبات دژی رژێمی دیکتاتۆری سەلڤادۆر دەکەن ، زۆر جاریش قووتابیان دەکەون سەر شەقامەکان‌و مان‌دەگرن‌و بێزاری دەردەبڕن‌و بەگیانێکی شۆڕشگێرانەوە دژی زوڵم‌و چەوساندنەوەو بێ‌کاری‌و هەژاری خەبات دەکەن کە هەندێ جار ژیانیان لەپێناودا دادەنێن ، بەرامبەر بەمە رژێمی دیکتاتۆریش بەتوندوتیژترین شێواز لەقووتابیا دەداو لەناو شەقامەکان دەستڕێژیان لێ‌دەکات ، لەبەر ئەوە هەموو ڕێکخراوە قووتابیەکان لەگەڵ‌میللەت‌دان‌و هیچ ڕێکخراوێکی راستڕەویان تێدا نی‌یە .

لە بارودۆخی سیاسی‌ی ئێستادا ، کە هەموو ڕێکخراوو پارتە سیاسی‌یە پێشکەوتنخوازەکان ئەرکی خۆیان کۆدەکەنەوە لەپێناوی رووخاندنی رژێمی دیکتاتۆری بۆگەن ، قووتابیان لەگەڵ تەوژمی خەباتی گەلدا هاوکارن .

« بەرەی کاری زانکۆیی » و « کۆمەڵەی قووتابیانی ئامادەیی » و « یەکگرتنی مامۆستایان‌و قووتابیانی شۆڕشگێڕی زانکۆ » ئەمانە ئێستا لەحاڵی حازردا رۆڵێکی باش دەگێڕن ، شیعرەکانیشم وەنەبێ تەنها باسی ئەو رۆڵە بکات ، بەڵکو سروودی قووتابیانی سلڤادۆرە ، ئەو سلڤادۆرەی کە ئێستا لەژانی لەدایك‌بوونی کۆمەڵێکی نوێ‌دا دەژی .

---

*** لە رۆژنامەی « الثورە » ١٤ـ١٢ـ ١٩٨٠ ـ لاپەرەی « الثقافە » .**

# گۆرانی فۆلكلۆری چی یە؟

■ ووریا ئەحمەد ■

گۆرانی « فۆلكلۆری » بریتیە لە هەلبەستێك ئاوازی بۆ دانرابێ ، بەلام نە هەلبەستەكە دەزانین كێ دایناوەو نە ئاوازەكەیش، لەناو كۆمەلێكی نەخوێندەواردا سەری هەلداوەو لەسەر دەمێكی كۆندا ئەم گۆرانیە بەردەوام بەكار هاتووە ، لێرەدا مەبەستم ئەوەیە كە بۆ ماوەیەكی زۆر « گوتراوە » ئەو ماوەیەش بریتیە لەچەن چەرخێكی دوا بەدوای یەك .

بەم جۆرە گۆرانی « فۆلكلۆری » جیاوازی هەیە لەگەل گۆرانی « میللی » دا ، چونكە گۆرانی « میللی » خاوەنی هەلبەستێكی ئەدەبی تەواوە .

هەرچەندە ئێمە ئەسلی ئەم هەلبەستو ئاوازەش گەلێ جار نازانین بە هەموو وردەكاریەكەوە لەبەر ئەوەی گۆرانی « میللی » لەناو كۆمەلێكی نەخوێندەواردا سەری هەلداوەو كۆمەلی واش زۆر گوێ ناداتە ناوی ئاواز دانەر یاخود شاعیر. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت كە لە واقعی ژیانی رۆژانەماندا ناتوانین سنوورێكی جیا كەرەوەی تەواو دابنێین لە نێوان گۆرانی « فۆلكلۆری »و گۆرانی « میللیدا » . چونكە هەر بە عەقل دیارە ، زۆر گۆرانی هەیە ئێمە بە « فۆلكلۆری » لە قەلەم دەدەین بەلام لەراستیدا « میللی »یە .

**ئێمە هیچ نووسراوێك یا بەلگەیەكمان بە دەستەوە نی یە تا بزانین كێ خاوەنی ئاواز یا هەلبەستەكەیە ، یا لەچ بۆنەیەكدا گوتراوە .**

زۆر جار ئەم مەسەلەیە ئالۆزتر دەبێ بۆ نموونە : ـ هەندێ لە شاعیران لە سەدەی (١٨)ـ هەژدەدا لە ئاوروپا دەستیان كرد بەدانانی هەلبەستی رێكو پێك بۆ ئاوازە فۆلكلۆریەكانو بەم كارەیان لایەنی ئەدەبیی گۆرانییە فۆلكلۆریەكانیان بەرز بووەوە ئەنجامیش ئەم هەلبەستە تازانە جێگای هەلبەستە رەسەنەكانیان گرتەوە تاوای لێهات هەلبەستە فۆلكلۆریەكان بە یەكجاری لەناو چوونو لەبیر چوونەوە ، فۆلكلۆری كوردیش نموونەی لەو بابەتەی تێدایە كە باسم كرد وەك : ـ گۆرانی لەبەر نازی چاو بازان بە ئاوازەكەی كە لەناوچەی كۆیەدا دەگوترێ « گۆرانیەكەش تایبەتە بەو كاتەی بووك دەگاتە بەر دەمی مالی زاوا ، كۆمەلێك برادەرو خزمو ناسیاوی زاوا دەچنە سەربان یاخود سەر شوێنێك كە بروانێتە سەر ئەو دەرگایەی كە بووك لێیەوە دێتە ژوور بۆ مالی زاوا، ئەم گۆرانییە دەلێن بۆ پێشوازی بووكەكە » بە هەلبەستەكەی « وەفایی » ئەوەی كە باسم كرد بەمندالی زۆرم دیتیە لە شاری كۆیەدا .

منیش لەبەر ئەوەی ماوەی چەند سالێكە خەریكی كۆكردنەوەی گۆرانی فولكلۆری كوردیم ، ودوای ئەوەی ئەم

گۆرانیەم لە هەندێ لە پیرەکانی کۆیە گوێ لێبوو ، بـــــەو هەڵبەستەی وەفایی کە دەڵێ :

**باشەو بڕوا سەحەر بێ .. باخی گوڵان وەبەر بێ**
**گەر تۆ مەیلت لەسەر بێ .. کافر ئیسلامی ناوە**

گەیشتمە قەناعەتێك کە ئەم گۆرانییە کۆن نییە .. بەڵام لە دانیشتنێکدا لەگەڵ یەکێك لەو پیرە بە ساڵاچووانەی کـــە بەهەلگری گۆرانی کۆن دەناسرێن ئەوەم بۆ ساغ بووەوە کـــە وەفاییش هەر وەك شاعیرە ئەوروپاییەکان بەهەمان شـــێوە هەمان ڕێچکەی گرتووەو ئەگەر ئەو پیرە بە ساڵاچووە نەبوایـە ئەوە هەڵبەســـتە ڕەسەنەکە دەفەوتاو لەبـــیر دەچووەوە هەڵبەستەکەیش ئەمەیە : ــ

**« موژدە بـــــە بولبول داهی**
**فـــەصلی بەهـــار ئامـــــادە**
**گوڵ بەهـــــەمی ڕەنگو ڕۆ**
**دیـــدەنی خەرامــــــادە » .**

زۆر جاری وا ڕوودەدات کە بەرهەمە ئەدەبیەکە زیـــاد دەکرێتە سەر ئەسڵە فۆلکلۆریەکـــــە ، ئـــەوە بابەتـــە فۆلکلۆریەکەمان لەگەڵ ئەسڵەکەدا بۆ جیا ناکرێتـــەوە ، بۆ ئەمەیش تەنیا ناوی ئاوازدانەرو شاعیر بەس نیە بۆ ئـــەوەی گۆرانی « میللی » بکەین بە « فۆلکلۆری » . « ســــروودی نیشتمانی » هەر چەندە یەکجار کۆنیش بێت هەر لە جەرگەی ئەدەب دەژمێردرێتو دەبێ لەلایەن « مێژوو نووســــــانی ئەدەبەوە » کۆبکرێتەوەو هەڵبسەنگێندرێ . لەراستیدا گۆرانی « فۆلکلۆری » یاخود « میللی » جیاوازیەکی تایبەتی هەیە لەگەڵ مەتەڵو چیرۆك هەربۆیەشە ئەمانە بەشێوەیەکی ئاسانترو زووتر بڵاو دەبنەوە کە ئەمەیشیان ئاوازەکە یارمەتی دەدات. وە دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین : کە [ سنووری نیشتمانیو ســنووری زمان ] زۆر جار نابێتە کۆسپ لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئاوازە فۆلکلوریەکان ، بۆ نموونە گۆرانی « وولاتم نۆرمـــــاندیا »ی فەرەنسەیی لەگەڵ ئاوازە فەرنسییە ڕەسەنەکەیدا بەهـــەموو سەرووی ئەلمانیادا بڵاوبۆتەوە .

**لە فۆلکلۆری میللەتی کوردیشماندا زۆر گۆرانی هەن ، کە هەمان گۆرانی بەهەمان ئاواز لە فۆلکلۆری نەتەوەکـــانی دراوسێی کوردا دەبیستین ، وەك عارەبو تورکو فارسو ئازەری ، ئەم گۆرانیانەیش ئەمانەن : ــ**



١ ــ گۆرانی « کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشتو کێو شینە » ک بەدەنگی خوالێخۆشبوو « مەلا کەریم » گوتراوەو ئاوازەکەی لەلای نەتەوەی عەرەب هەیە وەك لە گۆرانی « قدك المیـــاسر یا عمری »دا بۆمان دەردەکەوێ .

٢ ــ گۆرانی «کافوکێ» کە بەدەنگی هونەرمەندی گۆرانی بێژ « حسن جزراوی »، گووتراوە، هەمان ئاواز لەلای میللەتی تورك دووبارە دەبێتەوە وەك لە گۆرانی «هەلەیار زالم یار»د بەدەنگی «سێلدا» . وە لەم بابەتە ئاوازو گۆرانیانە نموونەی یەکجار زۆرمان هەن ئـــەم جۆرە گۆرانیـــانەیش هەر میللەتەو نەتەوەیەك بەرگری لێ دەکاتو بەگۆرانیەکی فۆلکلۆری ڕەسەنی خۆی دەزانێت . بەڵام لەبـــەر دوا کەوتوویی میللەتی ئێمەی کورد لەم بوارەداولەبـــەر هـــەبوونی بارێکی گونجاو هـــەمو

جۆرە مەرجێـــك لەلای میللـــەتانی دراوسێی کورد، ئەگەر ئاوازەکان کوردیی ڕەسەنیش بن کە ئەوان تۆماریان کردو کران بە نۆتەو خرانە نێو ئەرشیف ئەوە ئەوان دەستی خۆیاز پێش دەخەنو ئەوەی دوا ڕۆژیشمان کە ئێمە هیچ بەلگەیەکی بۆ بەجێ نەهێلین دەبێ چۆن بۆی بکرێ بەرگری لەم مافـــەی

خۆی بکات‌و دەم هەڵ بێنێتەوەو بڵێ ئەو ئاوازانە فۆلکلۆری کوردین؟ .. بۆیە پێویستە بڵێم کادرو هونەرمەندی کورد چەند پەلە بکەن لە کۆکردنەوەو شیکردنەوەی گۆرانی فۆلکلۆری کوردی‌و ساغ کردنەوەیاندا ئەوە درەنگەو زوو نی‌یە چونکە ئێمرو کاتی ئەوە هاتووە هونەرمەندانی کورد ئەم ئەرکە پیرۆزە جێ بەجێ بکەن .

## ■ نەتەوەکانی تر چییان کردووە بۆ پاراستنی گۆرانی فۆلکلۆری خۆیان؟

هەر دوو مۆسیقاری «هەنگاری» «کۆدای»و «بارتۆك» لە ساڵەکانی زووی ئەم چەرخەدا واتە لە ساڵی «١٩٠٠»ی ز بەدواوە، دەستیان کردووە بەگەڕان بەدوای مۆسیقاو گۆرانییە فۆلکلوریەکانی خۆیان‌و کۆیان کردوونەتەوە، تاوەکو ئەمڕۆش گەڕۆکە هەنگاری‌یەکان لەم کارەیان بەردەوامن‌و بە هیوای دۆزینەوەی زۆرترین ئاوازو گۆرانین ، کە دوو گەڕۆکەکەی یەکەمجار بەتەواوەتی دەستیان نەکەوتووە . ئەمە لەلایەکەو، لەلایەکی تریشەوە لەبەر دۆزینەوەی ڕێ‌وشوێنی ئەو تۆ کە پرۆگرامێکی ڕێکو پێکی هەبێت بۆ ئەوەی بتوانرێت ئامانجی زیاتری لێ وەدەست کەوێت ..

ئەو کەسەی یاخود ئەو کادرەی ئاوازو گۆرانی ی فۆلکلۆری کۆدەکاتەوە پێویستە ئاگاداری‌ی تەواوی لە کەسانی پێش خۆی هەبێت، بۆ ئەوەی بزانێ چ گۆرانی‌و ئاوازێکی فۆلکلۆری کۆکراوەتەو نووسراوەتەوە تاوەکوو جارێکی تر کۆی نەکاتەوەو بەڵکوو خۆی بەشتێکی کۆنەکراوەوە خەریك بکات .

ئاوازە فۆلکلۆریەکان لە هەنگاوە یەك بەدوای یەکەکانی مۆسیقا لە ئەوروپادا وەتاوەکوو ئەمڕۆش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندن بۆ مۆسیقارەکان بۆ سوود وەرگرتن لە رتمەکان‌و ئاوازەکانی‌و تێکەڵ‌کردنیان لەگەڵ ئاوازەکانی خۆیاندا «ئەمە دوای ئەوەی ئاوازو گۆرانی‌یە فۆلکلۆریەکان کران بە نۆتەو بوون بە ئەرشیف» ئەوجا مۆسیقارەکان کاری مۆسیقایی پێشکەوتوویان لەسەر بیناکردن بۆ ئەوەی مۆسیقاو گۆرانییەکانیان تام‌و مۆرکێکی نەتەوەیی بە ئاشکرا پێوە دیاربێت‌و هەر هونەرمەندێ بەگوێرەی توانا‌و پلیمەتی‌و زانایی‌و زیرەکی خۆی مامڵەتی لەگەڵ بابەتە فۆلکلۆریەکاندا دەکرد .

زۆر لە مۆسیقارە بێگانەکان کەڵکیان لە ئاوازو گۆرانی‌یە فۆلکلۆریەکان وەگرتووە بۆ ئەوەی تامە نەتەوەییەکە بلکێنن بە مۆسیقای خۆیانەوە؛ «وەك» شوبەرتی نەمساوی‌و، کۆرساکۆفی ڕووسی، سەمتانای چیکی . وە لەسەدەی بیستەمیشدا کارەکە زیاتر ڕوون بوەوەو پێشکەوت‌و ڕێگای تازە هاتە کایەوە بۆ پەیوەندی بەینی ئاوازدانان‌و مۆسیقای فۆلکلۆری . لەگەڵ پێویستی لایەنی هونەری بۆ کاری ئاوازدانان لە سەدەی بیستەمدا، پێویستی لایەنی بیرو هۆشیش هاتە کایەوەو هونەرمەندانی مۆسیقا وەك «خاچادۆریان»و «ئەمیرۆف» لە یەکیەتی سۆڤیەت‌و «کرشوین»ی ئەمریکایی کە توانی مۆسیقای ڕەسەنی زنجە ڕەشەکان بکاتە بناغە بۆکارە ئورکسترالی‌یەکان ئەمانەو زۆرانی تر توانیان سوود لە فۆلکلۆر وەربگرن‌و بیکەنە بەردی بناغەی کارە هونەریەکانیان . بەڵکو لە ڕێگەی فۆلکلۆریشەوە زیاتر توانیان جێ پێی خۆیان قایمتر بکەن . لەهەمان کاتیشدا هەردوو مۆسیقارە «هەنگاری»یەکە «کۆدای»و «بارتۆك» بوون بە پیشەوا لە ووردەکاری بنیاتنانی قوتابخانەی هەنگاری نوێ لە مۆسیقا لە ئەنجامی پشت بەستیان بە فۆلکلۆرو کەلەپووری نەتەوایەتیان‌و توانییان ئەسپی خۆیان لەم مەیدانەدا تاو بدەن‌و هەنگاوی خێراو سەرکەوتووانە بنێن‌و بەرەو لوتکەی داهێنان‌و خوڵقاندنی کاری هونەری‌ی هەمیشە زیندوی پڕ تام‌و چێژی سەرکەوتوو بچن .

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوە بڵێین کە کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی هەروا شتێکی سادەو ئاسان نییە، بۆ نموونە : «بارتۆرك»ی مۆسیقاری هەنگاری بەناوبانگ زمانی هەموو میللەتە دراوسێ‌کانی خوێندوەو فێری بووە وەك « زمانی یوغسلافی‌و عارەبی‌و رۆمانی » چونکە بەڕای ئەو بەبێ ناسین‌و شارەزایی لە مۆسیقای فۆلکلۆری‌ی میللەتە دراوسێکانیاندا ناتوانێ بەچاکی شارەزای مۆسیقای فۆلکلۆری هەنگاری ببێ‌و بیناسێ ..

هەروەها ژنە مامۆستاو پرۆفیسۆری ئینگلیزی خاتوو « پۆرشۆی ئیلۆنا » ماوەی یەك ساڵ‌و نیو لە گوندێکی میسری ژیاوە ئەوسا توانیویەتی ساڵی ١٩٧٠ پەرتوکێك دەربکات کە بریتی بێت لە هەڵبەست‌و نۆتە تەنیا دەربارەی گۆرانی فۆلکلۆری زەماوەند لەو گوندەو لە دێهاتەکانی دەوروبەریدا .

---

**سەرچاوەکان :**


١ ــ **زانیاری فۆلکلۆر ــ تالیف الکسندر کراب « علم الفولکلور » وەرگێڕانی بۆ عەرەبی رشدی صالح .**

٢ ــ **لەگەڵ مۆسیقای عیراقی : هونەرمەند : اسعد محمد علی.**

٣ ــ **« اصول» ی مۆسیقای فۆلکلۆری : اسعد محمد علی .**

٤ ــ **چەند ژمارەیەك لە گۆڤاری « القیثارة » .**


●



سێوە

# کاتێ «مەقامەکانی سێوە»م خوێندەوە

( ئەسعەد عەدۆ )
هەولێر

لە رۆژی ٢١ــ١٠ــ١٩٨٢دا مامۆستام ( کەریم شارەزا)ی بەڕێز دانەیێك لەم کتێبەی پێشکەش کردم ــ زۆر سوپاسی دەکەم ــ هەرچەندە لەم بەرهەمەی ئاگادارم ، یەکەم بە ئامادەبوونم لەو کۆڕەی هاوینی سالی ١٩٧٩دا کە نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەستنیشانی کردوە ، دووەم خۆم دەستنوسەکەم لە ( چاودێری چاپەمەنی ) لە بەغدا ، بۆ نووسەر هێناوەتەوە . بەلام لە هەمان رۆژدا کتێبەکەم خوێندەوە .. بەراستی مامۆستام خۆی ماندوو کردوەو بەمەش خزمەتێکی تری ئەدەبەو هونەری کوردی کردوە ، هەرچەندە لە خزمەتکردنی بەردەوامە ــ خوا بۆمانی بهێلێ ــ .

بۆ یەکەم جارە « دەم لەم بەزمە ئەدەم » ، ئەمەشم بۆ خزمەتی فۆلکلۆری میللەتەکەمانە ، ئەوەك بۆ دۆزینەوەی کەموکوورِی لە کتێبەکەی مامۆستا ( شارەزا )، بۆیە داوای لێدەکەم ئەم باسەم بەدلێکی فرەوان وەربگرێ بۆ ئەوەی ئەم مەعلوماتەی منو بەرهەمە بەنرخەی ئەو ببێتە خزمەتێك بۆ ئەدەبی گەلەکەمان ..

دەربارەی گۆرانیەکانی خوالێخۆشبو ( سێوە ) بە تایبەتی گۆرانیە فۆلکلۆریەکان وەك گۆرانی ( گولێو عایشەگولو سەحەرو پاییزو شەنگ مێرەمو نیوەشەو ) تێك هەلچوون بۆ نموونە :

**یەکەم** .. لە گۆرانی ــ گولێ ــ لاپەرە ( ٢٨ ) ئەمەمان بەرچاو دەکەوێ :

**« ئەرێ برادەرینە ئەگەر هەنییێ گورەجوانێ**
**لەبۆ من بمینێ بەوێ مانگی لەچاردە**
**کەوەتانی لە مابەینی هەورو ساماری »**

منیش گۆرانی ( ئازیز )م لە ژمارە ( ٦٤ )ی بەیاندا بلاوکردۆتەوە ئەگەر خوێندەواری بەڕێز سەرنجێك بداتە ناوەرۆکی گۆرانیەکە هەمان کۆپلەی دێتە بەرچاو : « هەنی لەبۆمن بمینێ بەو مانگی لەچاردەی هەردێ لە حەفت قەدەمان، لە نەحبەینی هەورو ساماری » .

**دووەم** .. مامۆستا پێش ئەوەی دەست بەگۆرانی ( عایشە گول ) بکا ئەم چەند دێرەی نووسیوە : « گوایە عایشەگول بووکی پەردەی سەعید بەگی برازای میر سولەیمان بەگی سۆران بووە ، سەعید بەگ بەرلەوەی بچێتە پەردەوە ، بەفەرمانێکی بەپەلەی میرسولەیمان ، لەگەل دەستە سوارێك بە وەفد دەنێردرێتە ( ئەستەمبول ) بۆ دیدەنی سولتانی عوسمانلی .. هتد » .

پاش چەند مانگێکی تر ــ ان شاء الله ــ نامیلکەیێکی فۆلکلۆریم بە ناونیشانی ( بەیتی ئایشەگولو لەشکری ) دەکەوێتە بازاڕ . لەو نامیلکەیەدا گوایە سەعید بەگ برا بچوکی میر سولەیمانەو بەرلەوەی بچێتە پەردەی بووکی ، دەچێتە شەڕی ( عەجەمان ) لەدەوروپشتی بەغدا ، گوایە دوای حەوت سال گەڕاوەتەوە هەریر . لەو ماوەیەدا ئایشەگول نەوەك عایشەگول ، ئەم ئایشەگولەش کچی میری هەکاری بووەو خێزانی سەعید بەگی کوڕی قولی بەگ بووە . سۆزی دەروونی خۆی بە چەندان ووشەی کاریگەرانە داڕشتوە کە پێی دەگوترێ ( بەیتی ئایشەگول ) ، نزیکەی چواردە کۆپلەیەو هەر کۆپلەی لە چوار پێنج نیوە دێڕ ێك هاتووە ، تکایە بۆ بەراوردکردن بڕوانە گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە ( ٦٠ ) ، دەقی ئەو بەیتەم بلاوکردۆتەوە ، ئینجا بۆ خوێندەوار دەردەکەوێ کە ناوەرۆکی بەیتی ئایشەگولی من ــ ببورن ــ جیاوازێکی زۆر زۆری هەیە لەگەل ئەوەي مامۆستا بۆ نمونە لە مەقامی عایشەگولی مامۆستا لاپەڕە ( ٣١ ) ئەوەمان دێتە پێشچاو « ئەگەر سەری من دەیێشی ، دری عایشێ بابان وێران ناسەکنی ، لەبەر هەرامە

زوگرتی ... هتد »

ئەوەی منیش بلاوم کردۆتەوە لە پێشەکی ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ : « سەرم دێشێ ، درم وەتی لەبەرغەمی دونیایێ، ئەو رۆ دوو رۆژە لە قارێ سوارێ خۆ هەر چ تارە چ تونـدە .. هتـد » .

**سێیەم** .. گۆرانی سەحەر لاپەرە ( ٣٣ ) ، کـــاتێ خوێندەوار دەست بەخوێندنەوەی ئەم گۆرانیە دەکـــا ... ئەوەندەی پێناچێ لە لاپەرە (٣٦) گۆرانی سەحەر تێکەلاوی گۆرانی ئەسمەرێ بووە ، بۆ ، نموونە : « ئەوەل سەحەرە .. ئەمن ئەوسارەکە نیازی دری منو .. هتد » .

**ئەمەش دەقی گـۆرانی (ئـەسمەرێ)یە کـە من سـاغم کردۆتەوەو بۆ گۆڤاری بەیانم ناردوەو ئەوە ماوەی دوو ساڵە، بەلام بە داخەوە تا ئێستا بلاونەکراوەتەوە :**

« ئەسمەرێ، ها .. ها .. ها، ئەی بەندەی موسلمانینە رەزالیلە لەرێ خوای .. لەدرمدا وەیە، بینایەکی لۆ ئەسمەرێ ماران دابنێن . دەبا باغەکی لۆ دروست بکەین .. ئەو باغەی‌هەر بەمسکینی، ئەگەر هەرارا، سوسنان بەبونان، رەشە رەحانی مـارویران، سۆرەگـوری بـاغانو گورە سەبـاحەی جوانە مەرگ .. خۆیان هاوێشتینەوە سـەر تاقـانو پەنجەرانو شانەشینانو حوروسیان، خۆیان هاوێشتینەوە سەربارستی پەرژینی، کیژ دەرێ :

سەیدی کبریانو دوازدە ئیمـامی دەشتی بەغـدایێ، وەبسەل قەرەنی، خدری زیندە، شێخ عبدالقادری گەیلانی، کە سەرداری شێخانە .. یارەبی ماحبەینی پایزو زستانان، خێر لەسەرو عەمرو مارو منداری خۆی نەبینی . ئەی بەندەی موسلمانینە رەزالیلە لەرێ خوای، ئەسمەر بەو باغەی رازی نیە! ئەرێ دەبا برێنە وەستا عەلی بێتە بەردوکانێ .. برێنە ئەو مارویرانەی بێتە بـەردوکانێ .. خەزێمەکی لۆ ئەسمەرێ دروست بکا، نەبگری بـەگازی، نەبجۆشینی بـە هەمبـانێ، نەلێی‌بدا بە چاکوچی، نە باوێتە سەرگێی زنـدانێ .. دەستێ من دامەنی وەســتا عەلی بێ ، ئەو خەزیمەی دەمست شاگردو نەفامو نەزانان نەنێ، نەکو خەزێمی گەلە گەورە بکەن، رووەمەتی خانەوێرانەی گەلە خرکەرانـەیە، شەوێ لـە سێ بـاری نیوە شەوێ لەمن بگری جێ‌بێ شـەو رامۆسـانێ، ئەرێ تانجێ، تانجە سێێ، ئـەرێ کیژۆرێ، خـوارکۆفێێ، کەرەم بکە .. بچینەوە شاێی، ئەسمەرێ .. ئەی بەندەی موسلمانینە رەزالیلە لەرێ خوای، ئەسمەر بەو خەزێمەی رازی نیە .. دەبا لانکەکی لۆ دروست بکەین، ئەو لانکـەی لەداری تووە، سەرچـاوکێ لانکێ چیتی قەرەم‌کار .. گلزکەنە خەیاتان، باوێرابگا زووە،

چەند گەرام لە شـاران لە شـارستانـان، لە شـانەشینان، لە حوروسیان، چەند گەرام لەو دنیایەی .. چ چاوم نەدی بە چاوی مەحبوبەکەی من بچی .. دەفعەکی چوومە شاری کۆیە، چوومە باغی حەمامۆکێ .. شاێك دەگەرا لەگەرێ دیلانێ رامام دوو چاوو، هەر بەچـاوی مەحبوبـەکەی من دەچوو، وەکی پسیارم کرد گۆتیان .. خۆ بابان کورە مێرمە جووە، لە خۆم وابێ لەمن ئابێ، ئەرێ تانجێ، میرشەرەفە، مەرجان کەتنە رۆخ سەدەفە، کیژ بەعام لە کوران دەکەن گەفە، ئەی بەندەی موسلمانینە رەزالیلە لەرێ خوای لـەدرمدا وەیە، لانکەکی لۆ ئەسمەرێ ماران دروست بکەین، ئەو لانکەی لەداری سەوری .. وەستابێ لـە حەرەبێ، شاگرد بێ لە دیاربەکرێ، دەستی من دامێنی وەستاو شاگردان بی رەزالیلە لەرێ خوای، ئەو لانکەی لە دەست شاگردو نەفامو نەزانان دا نەنێن، ئەو مارویرانە، نەکو کەوێ لانکێ درێژ ببری .. مەمکی خانە وێرانەی گەلەك خرکەرانەیە، شەوێ لە سێ بـاری نیوە شەوێ نەگاتە لێیو زاوێ کوری» .

**چوارەم** .. دەربارەی گۆرانی پاییز لاپەرە (٤١) ئەوەمان بەرچاو دەکەوێ: «گەلی برادەرینە ئەمن پاییزەکم گەپیەتێ، چ پاییزەکی فەقیرە !! کە دارە بەنێ مال وێران سێبەری خۆی لەمن دەکاتە سەرتیرە ... هتد » .

**وامنیش دەقی گۆرانی پاییز بلاو دەکەمەوە کە خۆم ساغم کردوتەوە:** «کور دەرێ .. سەدابی پیرە پاییزێ‌مە، وا گەیشتێ، پاییزی مار وێران لەمن بە هـەنگورە، ئەگەر دەچمـە سەرێ سەفینی هێشکەری سماقوولی دەربەندی گۆمـە سپانێ دارە کەوەتم زۆر بێ حدود، دەدیت پەلکی دارە بەنێ لەمن دەبوون سۆرە، وەی غەمە لەدرێ من . پەلکی دارە بەنێ لەمن دەبن سۆرە، کیژ دەرێ وەکی سوارێ من چوویتە سەفەرێ میرێ مبارك خەم لەدرێ من بابـان کورێ هـەردەبن زۆرە، وەی سەرگەردانو بەندەوارم لاوە . سەرگەردانو بەندەوارێ شلو ملانو نێك بەکەمبەزانم، سەدابێ پیرە پاییزێم ئەوا گەیشتێ، پایز ماروێران چەنـدە لەمن مەستـە لـە بۆ من برێن داکێ راوکەران بنێرنە کن دەستـە خوشکان دەبا بکەن غـەبابەتێ قەرێتەو رستە . کیژ دەرێ سینگێ ماروێران ئەورۆکە گەلەك شەپرو شەپرزەیە لەبەر هاتوو هاواری کۆمەرەکا سواران رم بەتۆپان ماین شێ‌یان نووسکەی دەتوولان پاشێ خۆ داوێتە بەرچەبەری نە تاژیان قایمە قایمەلانێ خۆ، دەگەیشتە کردۆکی نەدەوبەستان وەی سەرگەردانو بەندەوارم . سەدابێ پیرە پاییزێمە، وا گەیشتێ لۆت هـەردەرێم بەسـەری سەفینی سەرەکە لە سەراندا، گەواران دێنی کیژ دەرێ .. تاوەکی باران لە سوارێ من دەباری تەر دەکا دەستێ جاوێ رانەرکیبی

نا بەخوای ناو پەردەو خاشخاشەو دگدگەی زینی، وەی غەمە لەدرێ من . کیژ دەرێ ئەو لاوە وەکی لەمنی لەمارە بابەکەی من بکەوی رۆژێ تەنگانەو حەولەوەلایێ شینەکەکی ماروێـران شیرن لەپێش قۆشتان دەبەزی . سەدایێ پیرە پاییزیمە، وا گەیشتێ، ئەگەر لۆت هەردەرێم بەسەری سەفینی سەرەکە لەسەروانی، گەواران دینی سێبـەری خۆی هـاوێشتیتـەوە سەرچنارێ دیوانێ عەیشێ چاوبەرەك، ئەوا تێدە، ئەوە غەمە لەدرێ من . کیژ دەرێ چەند خۆشە لاوە، وەکی لە سێباری نیوە شەوێدا بێتەوە دەست باوێنـە سەرملێ ڕاستێ، دوو ماچلن بکا لە گۆیێ مەمکان، با مـاچ بکا هۆردوو چـاوێ لە خەوێدا، وەی سەرگەردانو بەندەوارم لاوە . سەدایێ پیرە پایزێم ئەوا گەیشتێ، پاییزی ماروێران لەمن هەوی داوە، دەچمە هیشکەری سماقولی دەربەندی گۆمەسپانێ، نیشـانێ پاییزێ پشیلۆکی قەلۆغانێ لەمن دەبوون بەراوە . کیژ دەرێ وەتی سواریێ من چوویتە سـەفەرێ میرێ ممبارك شینکێ ماروێران شیرن لە قایمەلانێ بە ڕەحەتی پاری داوە . ئەگەر سەدایێ پیرە پاییزێ وا گەیشتێ لە مەلی گەلاوێژێ ماروێران دەزرزی، ئەگەر مێرچاکان پێی خۆیان ناوە لە رکێبێ، گەنج عوسمان بەزرێکی داودی دەقەمری . کیژ دەرێ لاوە، دەس وەکەری گەلە ممبارکە ماروێران ، بـەران وەڵلا چ سـەرێ ناچێتە بنخاکی . سەدایێ پاییزێم وا گەیشتێ ئەگەر پاییزم ماروێران لەمن دەچووە سەر، ئەگەر جوابەکم دەداوە بە ملەکێ راژێ دەمدیت، کۆمەرەکی ئەشمیلان شڵو ملان، لۆ کاکێ توو دێنە خوارێ لە بێژنگ بەسەری . کیژ دەرێ نەعلەت لە بابی ئەو کەسیدا، وەکی عەز دەکاتن لە خوشکی برادەری . وەی سەرگەرادانو بەندەوارم لاوە، سەرگەردانو بەندەواری شڵو ملانو نێك بە کەمبەران لەزمە» .

**پێنجەم** .. دەربـارەی شـەنگ مێـرەم لاپـەڕە (٤٣) ، گۆرانیەکە دەڵێ : « ئەگەر هەنێ شەنگ مێرەمێ، لـەبۆمن بمینێ بەوێ مانگی لە چاردەی کە وەتانی خەریك مایتەوە، لە مابەینی هەورو ساماری، ئەگەر مەمکی شەنگێ لە بۆ من بمینێ بەوی چار قوبەی ئالتوونێ، کە وەتانی عەلی بەگی داسنی دەیداتەوە لە چارگۆشەی هەرامە مەتاری» .

نیوەی ئەم کۆپلەیە لە گۆرانی «گولێ»دا دووبارە بۆتەوە، هەروەها منیش بەرامبـەر ئەو گۆرانیە کۆپلەێك لە گۆرانی (ئازیز) دەنووسمەوە، بۆ بەراوورد : « هەنی لە بۆ من بیمنێ بەو مانگی لە چاردەی هەردێ، لە حەفت قەدەمان، لە نەحبەینی هەورو سامار .. مەمکی لە بۆ من بمینێ بەو گۆیێ ئاڵلوزکرای، کوڕە عاشیرەت دەدەن لە گۆشێنە مەتاری» .

**شەشەم** .. گۆرانی نیوەشەو، لاپەڕە (٤٥) ئەم مەقامە هیچ پەیوەندێکی بە (نیوەشەو)ە فۆلکلۆریەکەوە نیە هەروەهـا دووبارە لە لاپەڕە (٤٦) لە هەمـان مەقـام ئەوەمان بەرچـاو دەکەوێ : «مەمکێ ئەو بابان وێرانەی لە بۆ من بمینێ بەوان فنجانو فەخفوریان، کەوەتانی لە دیوەخانەکان پێی دەخۆنەوە قاوە، لەگەڵ هەرامە شەربەتە» .

**وەیان دەڵێ** : « دەم لەسەر ناسکێ ڕوومـەتم هەلبگرە بەسم شەمامەو شەمامە بەندی باخەلان بگۆوێنە» .

**ئەو دوو نموونـەیەش لەناو گۆرانی (ئازیز) دەرهاتووە، بۆ سەرنجدان:**«دەرێ دەستم لەسەر شەمامەو شەمامە ڕەنگان هەگرە، لیۆم لەسەر ناسکێ ڕوومەتان بەردە ــ دەویتباب ــ هەمووت هیشك کردینە بە برکێوە» .

**وەیان دەڵێ** : «مەمکی لـە بۆ من بمینێ بـەو فنجـانی فەخفوری کوڕە عاشیرەت پێ دەخۆنەوە قاوەی دەگەر ماخۆ مردە شەربەتێ» .

**هـەروەهـا بۆ زیـاتر روون کردنـەوە، دەقی گـۆرانی (نیوەشەو)ە فۆلکلۆریەکە بلاودەکەمەوە، بۆ ئێوەی خۆشەویست:**

« ئەی ئامان .. هەی زالم .. ئەی ئامان، کیژ دەرێ ئەگەر شەوم لێ دەگاتە مەجالی نیوە شەوان، کل گەورە کیژ هەڵدەستن لە مارە بابـان هەردەکەن ئاگران، خـەویان لێ ناکەوێ لەبەر خەیاڵو فکرو هووردە هووردە تەسەوران .. ئەی ئامان .. هەی زالم، کیژ دەرێ خۆ لەخەمی خۆ دانیمە، ئەمان لە خەمی هێتیمە لاوەکەی خۆم دامە، گەلەك مندارە گەلە نەقامە، ئەکوو شەوێ لە سێباری نیوە شەوێ بکەوێتە پێش قەرەوران، ئەی ئامان .. هەی زالم، نیوە شەوە . کیژ دەرێ ئەمان هەی ئامان هەی زالم دوێنێ هێوارێ ئاگات لێ نـەبوو گوولەکەی مێردان، پیسکەکەی مێردان، خوول خولکـەرەی مێردان، ئەزی لەسەر توو ئەنداسم هەی زالم، دارێکی دا لە زەندێ بە بازن تەعجیبیم مابوو قەمچەو قەرەپۆش لەسەرێ من بابان کۆرێ لۆ تاراتن، ئەی زالم نیوە شەوە . کیژ دەرێ بەسەر ئەو تاقە براکەم بەچ سواوچو گوناحێ خۆم شك نایێ لاوە، ئەمیدی دوێنێ هێوارێ هەر لە دەراوێ کانیێ هەتا پێش دەرکی مارەوێرانە خەزووران، لەگەر هێتیمـە لاوەکەی خۆم بەدەست ئەملانو گفتوگۆ هاتم ئەی زالم، هەی زالم، نیوەی شەوە . کیژ دەرێ ئەمان ، هەی ئامان، ئەی زالم نزانم زێدە لە هەموو شەوان ئەمن ئەو شۆکە خەو لەچاوێ من بابان کۆرێ هەرمایە، هەی ئامان . داك دەرێ کیژم گەلە بێوەختە وەرە ژووورێ گەلە بێوەختە، کیژ دەرێ دایە ڕەزالیلە بەشکە خواو ڕەسووران ئەگەر لێم نەگەڕێی ، زێدە لە هەموو شەوان ئەو شۆکە ئەو هەتیمە لاوەم هەر بەتەمایە، هەی ئامان، ئەی زالم

نیوه شەوه . کوڕ دەرێ ئامان هەی زالم ئەگەر لەبۆ مەعشوقەی خۆم هەردەرێم، هەر پێ هەر نەگۆتی، ئەگەر هەناوێ دایکی بمینێ بەو ڕەشمالی بایزی کامەلای لە دەشتی کاولە قەراجو مەخموران لەبەر چرای نەسۆتێ . ئەگەر ڕوومەتی ئەو خانە وێرانە لە بۆ من بمینێ بەو سۆرە گوری لە باغان لە باغی کۆیێ، گەردەنی لە بۆ من بمینێ بەو سوسنەکەی ساوا وەکی هەموو ئەوەل پاییزان سەرێ خۆ دەردینی لەبن خەتۆکی جۆتی، هەی ئامان، ئەی زالم نیوە شەوە، کوڕ دەرێ ئامان ئەی ئامان ئەی زالم دونێ هێوارێ نازدارەکم دی، نازدارەکی چەندی سەر بەزێرە، ئەگەر سەلامەکم دەکرد لە بەژنی باریکو هەردوو چاو بەکلو کەپووی بەخەزێمو نێکی بەکەمبەر تەعجیبیم مابوو ئەو خانە وێرانە لۆ وەها ڕوێ خۆی لەمن وەرگێڕا، ئەی ئامان . ئەگەر شامو حەرەب دووتای زولفانت قۆجە موسرت سەربارە وێرا، ئەگەر لەبۆت بە گەلاوێژان هەر دەرێمو هەردەهات لەلای بێژنگ بەسەری . کوڕ دەرێ ئامان، ئەی ئامان، هەی زالم چاوێ مەحبوبەکەی من لە بۆ من بمینێ بەو ئەستێرەی جەددی هەردێتن لە پانایێ گردی، ڕوومەتێ ئەو مەحبوبەی لە بۆ من بمینێ بەو سۆرەگورێ لە باغی کۆیێ لەگەر سبەینێ عەلێکی بەیانی بلبلی مارووێران سلاو لێ کردی، کیژ دەرێ نەعلەت لە بابێ ئەو کەسی وەکی بە نوێژی نیروانێ هاشا لە مەعشوقەی خۆ کردی، هەی زالم نیوە شەوە» .

**حەوتەم** .. لە لاپەڕەی (٦٦) ئەم ناونیشانەمان دێتە بەر چاو «دەقی ئەدەبی‌ی مەقامەکانی سێوەی هونەرمەند»، بە تایبەتی دەربارەی پەیوەندی مەقامی (گولێ)و (عایشەگوڵ) مامۆستا دەڵێ : «ڕەنگە هەردووکیان یەك (بەیت) بن» . بەڵام ئەگەر بێتوو ئەم گۆرانیە بەراوورد بکەین لەگەڵ (بەیتی ئایشە گوڵ)ی هەکاری، بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازیان هەیە .

لە بەیتی ئایشەگولدا کە من ساغم کردۆتەوە، ئایشەگوڵ باسی ئەو ڕۆژە دەکات کە سەعید بەگ چۆن لە هەکاری بووەو دلوای ماچێکی لێ کردوە ئەویش ماچەکەی نەداوەتێ، هەر وەك لێرە بۆمان دەردەکەوێ : «ئەرێ خودێ لەخۆم بابان وێرانێ قەدکەس نەمایێ سوارێ لاوین هاتە پێش دەرکێ مارێ بابێمە لە دیار دونیایێ ماچەك لەمە خواست بەدەستی شکا بەچاوی کۆرە مە نەدایێ» . هەروەها ڕۆیشتنی زاوا جوانەکەیو بیرکردنەوەی لە برینداری دوای لەکوشتنی سوارێ لاوین، هەروەها باسی خۆشی مالی باوکیو ناخۆشی مالی خەزووران دەکات .. هەروەها باسی ڕۆیشتنی سەعید بەگ دەکات کە چۆتە بەغدا بۆ شەڕکردن «سوارێ من ئەوسار حەفت سارە چوویتە بەغدا زەمینێ » ... هتد .

بەڵام گۆرانیەکانی هونەرمەند سێوە هەر ئەو باسەی تیا نیە ! ئیستا زۆربەی خەلکی کوردستان بەهەر جۆرێ شارەزاییکیان هەیە لە بەیتی ئایشەگوڵ چۆنەو چۆن نیە !.

**هەشتەم** .. لە لاپەڕەی ( ٦٧) ئەم ناونیشانەمان چاو پێ دەکەوێ : « دەبێ کێ دەقی ئەدەبی‌ی مەقامەکانی سێوەی دانابێ ؟ » مامۆستا بیری بۆ لای ( عەلی بەردەشانی ) دەچێ ، بەڵام بەهەر جۆرێ دەگاتە سەر ئەو ڕایە کە نەناسراوە ، بەڵام دانەری ئەم مەقامانە شارەزاییکی تەواوی هەیە لە کەلەپووری میللەتەکەمانو دراوسێکانمان .. هتد .

منیش دەنگم ئەدەمە پاڵ دەنگی مامۆستا بۆ زرنگی دانەر بەڵکو دەڵێم شارەزایی لە جوگرافیاو فەلەکیشدا هەبوە، هەروەك لە گۆرانیەکاندا بۆمان دەردەکەوێ ، بەڵام من ئاگادارێکم لەو بارەیەوە نووسیوەتەوە لە گۆڤاری بەیان ژمارە (٦٤) لاپەڕە (٧٢) هەروەها دەست نیشانم کردوە بۆ کۆڕی هاوینی سالی (١٩٧٩)ی مامۆستا ( شارەزا ) بەڵام بۆ دڵنیایی وا دەقی ئەو گفتوگۆیە بلاودەکەمەوە کە لە ڕۆژی ٢٨ــ٣ــ١٩٨٠ لەگەڵ کاك ( عەزیز شێخ مەحمەد عەزیز )ی بەیت بێژم کردوە ، لە لای خۆم تۆمار کراوە : « باپیرە گەورەمان لە ( قەڵاچۆلان ) بووە ، ئێمە بابانین ، کاتێ ( قەڵاچۆلان ) چۆڵ کراوە باپیرەم دوو برا بوونەو هاتوونەتە ( کۆیسنجق ) ، کاری چەخماخچیان کردوە ــ واتە خەنجەرو شیریان دروست کردوە ــ لە یادمە پارچە ( زرێ )و ( سەرەرم ) لە مالمان مابوو ، باپیرەم عیشقی کچێکی کۆیی دەبێ ، بەڵام کەسوکاری کچکە بەوە ڕازی نەبوونە ، بۆیە مالیان بارکردوە بۆ ناو هۆزی ( گەردی ) وە لە گوندی (بەحرکە)ی نزیك شاری ( هەولێر ) جێنشین بوون ، ناوبراو لە بەحرکە لە دایك بووەو تەمەنی (٥٣) سالە ، لە سالی (١٩٦٠) هاتۆتە شاری هەولێر ، بۆتە کرێکار لە پارێزگا .. ئێستاش خانەنشینە . کاکی ناوبراو دەڵێ : ئەم گورانیە فۆلکلۆریانە لە دانانی باپیرە گەورەمە، لە عیشقی کچێکدا گرتوویەتی لەمانە گورانی ( ئازیزو نیوەشەوو ئەسمەرێو وەرانو پاییز ) کە هونەرمەند ( سێوە ) هەندێکیانی کردوە بە مەقامو گورانی‌بێژ ( ڕەسوول گەرد )یش چەند کۆپلەیێکی کردوە بە حەیران . بەڵام من چوومەتە لای هەردووکیان واتە ( سێوەو گەردی ) پێیانیم ووتوە کە ئەم گۆرانیانە لە دانانی باپیرەمەو کەموو کووڕی تیایە ! گوایە هەردووکیان بۆیان سەلماندوە . بۆ زیاتر ئاگاداری ناوبراو خۆی ئەم گۆرانیانە بەدەنگی خۆی دەڵێ کە جۆرەکە پێی دەڵێن ــ نەقێیانە ــ بۆیە بە دەنگی خۆی دوو کاسێتم تۆمار کردوە .

**لێرەدا کۆتایی بە باسەکەم دێنم ، تکام وایە ئەو شی کردنەوەیەم لایەنێکی گرتبێ لەگەڵ کتێبە بەنرخەکەی مامۆستام ( کەریم شارەزا )ی بەڕێز ، بۆیە تکا لە خوێنەواران دەکەم گلەییم لێ‌نەکەنو من پێشەکی دەڵێم سوپاستان دەکەم .**

# سڵاوی «کاروان»مان

## لە «بەیان و ڕۆشنبیری نوێ»مان لە بیرەوەریی دەرچوونی یەکەم ژمارەیاندا

مانگی پێشوو (تشرینی دووەم) مانگی بیرەوەریی دەرچوونی یەکەم ژمارەی (بەیان ـ ١٩٦٩) و یەکەم ژمارەی (ڕۆشنبیری نوێ ـ ١٩٧٣) بوو کە یەکەمیان لەوتەمەنەیدا ژمارەکانی خۆیگەیاند بە (٨٣) و دووەمیان بە (٩٥).

گومانی تێدانییە کە هەردوو گوڤار لەو ساڵانەی تەمەنیانداو بەلاپەڕەکانی ئەو (١٧٨) ژمارەیەیان، دەورێکی گەورەو کاریگەریان لە خزمەتکردنو گەشەپێدانو بەرەپێشەوە بردنی ئەدەبو ڕۆشنبیریی کوردیدا گێڕاوەو ،بگرە چەندین شاعیرو چیرۆکنووسو ئەدیبی لاومان کە ئێستا جێ پێی خۆیان لە کوڕی ئەدەبو نووسیندا کردۆتەوە، نۆبەرەی بەرهەمیان یەکەمجار لە سەر ڕووی ئەو لاپەڕانە چاویان بەڕووناکیی بڵاوکردنەوەدا هەڵهێناوەو بەدوایدا ڕێگای بەردەوام بوونو پێشکەوتنیان پێ گرتوونەتە بەر. بۆیە ئێستا کەسێک نییە نکووڵی لەو دەورە کاریگەرەیان بکا ، هەروەکوو هەموو ئەدیبو ڕۆشنبیرانو خوێنەرانی کوردیش بەچاوی ڕێزەوە تێیان دەڕوانن‌و هەردەم بەتەنگیانەوەن‌و چاویان لەدووی دەرچوونی ژمارەی نوێیانە .

(کاروان) ی ئێمەش کە خۆی بەهاوەڵێکی تەمەن بچووکیان دەزانێ‌و لەخزمەتکردنی ئەدەبو ڕۆشنبیریی نەتەوەی کوردماندا ، چاوی بڕیوەتە ئەو دەورەی کە ئەوان لەو ساڵانەی تەمەنیاندا گێڕاویانەو تەقەلا دەدا وەك ئەوان ئەرکی پیرۆزی سەرشانی خۆی بەرامبەر بەوشەی شەرافەتمەندو خێرخوای کوردی بەجێبێنێ ، بەبۆنەی ئەو بیرەوەرییەی دەرچوونی یەکەم ژمارەیانەوە ، لە ناخی دڵەوە گەرمترین سڵاوو ڕێزو خۆشەویستیی برایانەو هاوپیشەییمان پێشکەش بەدەستەی نووسەرانو کارگەرانیان دەکەین‌و بە دڵ هیوای بەردەوامییان لەو دەورە مەزنەدا بۆ دەخوازین کە لەبواری ئەدەبو ڕۆشنبیریی نەتەوەی کوردماندا دەیگێڕن .

(دەستەی نووسەرانو کارگەرانی کاروان)

---

● لەباسەکانی ژمارەی داهاتوو :

١ ـ فایلێك بە بۆنەی بیرەوەریی (٦٢) ساڵەی سوپای قارەمانمانەوە

٢ ـ ئەدیبو ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر ڕۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەورووپای ڕۆژگاری (ڕێنیسانس) دا — د. کمال مظهر احمد

٣ ـ داستانی کەرو کولك بە هەردوو شێوە ، کرمانجیی ژووروو ، کرمانجیی خواروو — شەکوور مستەفا

٤ ـ ڕێنووسی کوردی لەڕەگو ڕیشەوە — د. ئەورەحمانی حاجی مارف

٥ ـ فەرهەنگێکی زانیاری — کمال جلال غريب

٦ ـ لەگەڵ دیداری دووەمی چیرۆکی کوردیدا — مستەفا صالح کریم ، ڕؤوف بێگەرد ، عبداللە ئاگرین ، ڕؤوف عثمان ، حەمەسەعید حەسەن .

# ڕەخنەیەك دەربارەی زاراوە زانستییەکان

بەشی سێیەم و کۆتایی

ڕەئووفی ئەحمەد ئـالانی

لە زۆر شوێندا گوتومە : ـ سەرەی ئەوەمان هاتوە کە خەرمانە بەخێروبێرەکەی بەرهەمە زمانیەکانمان ، بەشـەن و کەوبکەین .. هەڵبژاردەکەشمان پوخت و بە ئـەندازەی پێویست بێ ـ دەنا زۆربێ و بۆربێ ـ دەبێتە تەگـەرەیەك و ئەوسەری دیارنەبێ !

■ ل ٢٠ : « الضبط = ڕێكهێنان » .

وشەیەکی دیکەشمان هەیە کە « دابین » ەو بە چ وگەکاری ( بوون ، کردن ) گەردانی پێدەکرێ ، دەگوترێ : ـ وڵاخەکە ئەوەندە چەمووشە ، دابین ناکرێ .. فلان بێدەسـەڵاتە . منداڵەکانی پێدابین نابن .. یـان بۆخۆی دابین بووە ... دەشگوترێ : ( کابرایەکی بە ضبط و ربطە ) .

لە هەندێ فەرهەنگۆکدا(١) ئەمانەش دەکەونە بەرچاو :

ـ ضبط : دابین کردن ، داگیرکردن ، خۆڕاگـرتن ، ڕاگەیاندن ـ

وشە کوردیەکە چۆنی بەر بۆ ڕەهابووبێ و بەمەواتـاو بەووانا ـ لەرستەزای خۆیاندا ـ گونجانبیەتیان ، پێویست ناکا ئێمەش ڕیزی لێدابمەزرێنین و چەندان زاراوەی خۆمانەی لە قەبرغەبدەین ، بەلای منەوەو بۆ ئێرە ئەوەندە بەسە کە بڵێین : « الضبط : دابین کردن ، انضباطیە : دابینی » .

■ ل ٢١ : « العلة الفاعلية = بنۆسیکارایی ، العِلیّـة = بنۆسیاری »

لێرەدا کۆڵەوارم ، چونکە نازانم بێژەی « بنۆسیار » لە کوێوەو لەچیەوە هێنراون !؟ لیژنە دەیتوانی بۆ ئەم زاراوەیەو چەندان زاراوەی نائاشکرای دیکە ، چـەند پـەراوێزو لێدانەوەیەکی تەرخانبکردایە ..؟!

■ ل ٢٢ : « غیر مباشر = تیان » .

پێویستبوو ڕوونبکرێتەوە ، چونکە تازەبابەتە بەش بەخۆم بە بەرامبەرەکەی ( غیر مباشر ) نەبێ نازانم مانای چیە ؟

بەڵام لەلاپەڕە (٢٣) یەمدا نووسیویانە :

« المباشر = یەکسەر » . کەواتە لێرەشدا بۆمان هەیە کە بڵێین (نایەکسەر) » .

دەبێ لەوەش بە ئاگابین کە لە شارباژێڕدا زاراوەی « تیان ، تیانە » بۆ ( مەنجەڵ و مەنجەڵۆك ) بەکاردەهێنن کە لە ماددەی مس بن . وێڕای هەمووی ئـەم دوو زاراوەیە زۆر باون ، کە دڵێین : « ڕاستەوخۆ = مباشر ، ناڕاستەوخۆ = غیر مباشر » . گرنگ پێك هێنانمانە لەسەر لایەکیان و ئـەوانی دیکەش بۆ زمانی قسە .

■ « فطری = زگماکی » .

لە لێدانەوەی مەبەستی ئەم وشانەی خوارەوەدا چڕیەك بەدی دەکەم :

ـ فطری = خِلقی ، فطری = وراثی . وراثی ... ـ

لێرەدا جووتە زاراوەی « سروشتی ، زگماکی » بـە یەکیاندداوە ؟!

پێویستیمان بەچی هەیە ؟..

ا ـ ئاگاداری کردنی زاراوە ڕۆیشتووەکان ، بەمـەرجێ هەڵەنەبن .

ب ـ بەپێی توانا تایبەت کردن ، ئەوسا دەتوانین بنووسین:

« فطری = طبیعی : سـروشتی . فطری = خِلقی : ئافەریدەیی . فطری = وراثی = زگماکی .. »

بۆیە لەگەڵ ڕای لیژنەنیم کە بەرەهایی بگوترێ : « فطری = زگماکی » .

■ ل ٢٣ : « اللا ادرية » کراوە بە : « نازانم کاری »

دڵنیام کەبەڕێزانی لیژنە لە بەندە ، پەیبەرترن .. بەڵام ئەوەی کە هەستی پێبکەم بالاپێوی وشەعەرەبیە سـەیرەکەیە ، لەباری ڕێزمانەوە بەهەر زرە بیانوویەك بێ خۆی داسەپاندوە .. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نامۆیی ئەوزمانە لە ڕێژگەی لێکدراودا . بۆ ئێمەی دەوڵەمەند لەو داینامیتەدا ، پێویستناکا زاراوەیەك بخەینەوە کە فڕی بە هیچ یاسایەکی ڕێزمانەکەمانەوە نەبێ .. وەك گوژمەکردنی :

ـ ئامرازی نەفی + کاری ڕانەبوردوو + ڕاناوی کەسی

یەکەمی تاك + ناوی مەعنوی + پاشگری « یـ » نیـبەت ـ.
ئەمەش بەپاساودانی ئەوەی‌کە « نازانم‌کاری » ناو = ئیسم ـ ە
بۆ رێبازێکی فەلسەفی .. گوایە بەو تەءویلە لە رستەو
جوملەگەل دەشۆرێتەوە !!

**تێ‌چینێك :**

لەو تێڕوانینە دەگمەنەوە ، ئەو « یحیی » ناوەی کە بە سەروسەکوت لە فعل مضارعەوە هاتوە . ناوی « ئەژی » مان لێ‌خواستوە !!

دواتر وا پێشنیازدەکەم کە سوود لەم بابەتە رێـژگانەی خوارەوە وەربگرین : خۆنەزانکاری ، نەویستزانی ..

**■ « ما وراء الطبیعة = ئەودیو سروشت »**

ئەگەر بگونجێ « سروشت بەدەر ، نەدیوسروشت ... خۆمانەترن . یان وشەیەکی باشتر لە گشتیـ ن ؟!

**■ « المتسق = ساز » .**

لە لاپەڕە / ١٦ ـ دا نووسراوە : تکیف = سازان . ئنجا نازانم هەردووکیان لەیەك سوورگەدان .. یان ..؟ دیسان لە لاپەڕە ـ ٢٤ ـ دا : « المتناقض = نەسازاو » بەلامەوە وشەی ( رێك هاتو ) بگونجێ .

**■ ل ٢٤ : « المثل الفطریة او الموروثة = نموونەی زگماکی » .**

بۆ ئەوەی کە لە قالبی خۆمانەتردا دابڕێژرێ چەند رستەیەکی دیکەین دەخەمەپاڵ ، هەڵبژاردنیش دەدەمە دەست زماندۆستان :

| **بەپێی کتێبەکە** | **پێشنیازی من** |
|---|---|
| نموونەی زگماکی | زگماکە نموونە |
| « المثالیە الموضوعیە = نموونایەتی بابەتەکی » | نموونە بابەتی . |
| المثل العلیا = المثل العلیا | |
| المثل الأعلی = نموونەی بالا | نموونە بالا ، |
| المثالیە النقدیە = نموونایەتی رەخنەکار | نموونایەتی رەخنانە |
| المثل الافلاطونیة = نموونەکانی ئیفلاتوونی | نموونە ئیفلاتوونیەکان . |

**■ ل ٢٦ : « مذهب النزعات الروحیة = ڕارەوی تۆزکاڵی گیانەکی » .**

بە واتای فەرهەنگی چ ( ڕاڕەو ) و چ ( رێباز ) هاووانان. بەڵام یەکەمیان لە واتا ئەسلیەکەیدا خۆی خواردوەتەوە : ( شوێنی پیدا رۆیشتن ) دوەمیشیان لەمێژە زمانی پێ‌ڕاهاتوە بۆ ئاوەڵواتای مذهب ، منهج .. هتد بەنموونە کە گوتمان : « ریباز یان رێبازگەی فەلسەفی .. » دالآنو شتی وامان نایەتە زەینەوە ..!!

دیسان لە بەرنامەی زانستیدا لەمێژە زاراوەی « گەرد و گەردیلە » لەکاردان . ئنجا تۆزکاڵو تۆزقاڵ ـ هەرکامیان‌بن ، لە ( توزمثقالو مثقالەذرەوە ، سواونەتەوە ) ، بۆهەمان مەبەستی پێشو پێشنیازدەکەم کە بنووسین : « ریبازی گەردیلە گیانەکیەکان » .

**■ « مذهب اللذة الفردیة = ڕارەوی خۆشایەتی خۆویست».**

زاراوەی ـ خۆویست ، خۆنەویست ـ زانستانە بۆ « ارادی ، لا ارادی » بەلای منەوە بەجێن . کەواتە بۆم هەیە بڵێم باشتروایە کە بۆ هەمان مەبەستی پێشو بنووسرێ : ( رێبازی خۆچێژ .. یان رێبازی خۆچێژایەتی ) .

**■ ل ٢٧ : « مـذهب المصادفة او الاتفاق = ڕارەوی ڕێکەوتەکیەتی » .**

ئەگەر بڵێین : ـ رێکەوتە رێباز . یان ریبازی رێکەوتەیەتی ـ نە مەبەست لەدەست دەچێو نە دەموزبانیش تووشی بارقورسی‌دەبن .

**■ « النظریة النسبیة = ڕارەوی پەیوەندایەتی »**

لیژنە خۆی لەمن ئاگادارترە کە «رێژە = نسبة » زاراوەیەکی زانستیەو رۆیشتوە .

زاراوەکانی ( پەیوەندی ، پەیوەندایەتی ) ش لە رێزمانو کۆمەڵایەتیدا ، چەسپاون .

جائەگەر « رێژە » هەڵەیەکی زەق‌بێو مەبەستی لەمەڕ ( تعلق ، ربط ، علاقە )ەش هەر ئەم « نسبة »ە بن ، ئەوارێگەی هیچ رەخنەیەکم‌نیە .. دەنا دەبێتە جێگەی تێڕامان ..!!

**■ « المرتجل = سەرزارەکی »**

- سەرپێیانە قسەیەکی راهاویشتێ .
- بەسەرپێییەکەوە چاکوچۆنیم‌کرد .
- سەرزارەکی پێم‌راگەیاند ..

بەپێی بۆچوونم پێزبەو بنکانەوەدەین بەرامبەر بەم مەبەستانەی خوارەوەو لە پێناوی تایبەتکردنی چەند زاراوەیەکدا :

١ ــ المرتجل : سەرپێیی .
٢ ــ المكالمة الشفهية : سەرزارەکی
٣ ــ الامتحان الشفهی : تاقیکردنەوەی زارەکی

وەك چەندجار ئەوەم درکاندوە شانبەشانی چەمكوباری هەموارانەی زاراوە ، دەشێ لایەنی هونەریو تیبەتکردنو ئاوازو چێژو تەمەن ، رەچاوبکەین .

■ « النظرية الغائبية = دیمانەی دوایەکیەتی »

تائێستاش لەسەر زاراوەیەك بەرامبەر بە « نظری » چەقی خۆمان نەگرتوە ، وشەی ( دیمان ، دیمانە ) لەگەڵ ( دیمەن ) یەك دەگرنەوە ، ئەویش بریتیە لە « تەحر و شێوە »(٢) .

لەبرێ فەرهەنگدا ، نووسراوە :

را ، ئەندێشە ، بینایی ــ یان ئەوەتا کە پێویستی بەبەڵگە هەبێ ، بەرامبەری « عملی » یە(٢) .

لەلایەن خۆشمانەوە دوولانە بۆی دابەزیوین ، هەندێك دەنووسن :

ا ــ بیردۆزی لە ریازیاتدا .

ب ــ قسمەبزی لە پەروەردەدا(٤) بەپێی لایەنەفکریو ئەندێشیەکەی بیردۆزیو شتیوا سەریهەڵداوە .

ئەوانەشمان کە لە زادەی « نظر ، ینظر » و« فانظر الی الابل کیف خلقت » هەڵدەڕوانن ناهەقیان ناگرینو بەدیوی دەرەوەی چاوەندازبوونو بە « قسەبزیو دیمەنو دیمانە » رەنێویانهێناوە ئەوانەشمان کە زۆر کەیفیان بەزاراوەی هەندەراندێ ، بە زاراوەی « تیوری » بێنەوەبەرەی پێدەکەن. کە هەر لایەنە رواڵەتیەکەشبێ ئەوا « دیمانە » مان بەخێرو بڕیاری لەسەربدەین .

نووسیویان : « دوایەکیەتی » بەهەرحاڵ بە پاشگری «ەکی» پێملبوون و دەتوانین بڵێین : ــ دیمانەی دوایەکی ــ ئیدی چلزوم دەکا پاشگری ( + ەتی ) بکەینە سەربارو دوو پاشگری نیسبەتی لێتاوبدەینو تەواوەکی زارمانی پێ سەغڵەتبکەین !!

■ « الموقف = هەڵوەست »

لاری لەوەدانیە کە لە برێ ناوچەدا ئاوەهای دەبێژن .. بەلام لە نووسینی باودا « هەڵوێشت » چەسپاوە .

لەلایەکی دیکەشەوە ، لە شێوەی گۆڕاندا بڕگەی « بە » دەگۆڕێ بە بڕگەی « وە » ، ئنجا کە گوتت : هەڵوەست ـ یەکسەر بە ( هەڵبەست ) تێدەگا ..؟

جا بۆ ئەوەیکە تووشی چەواشە نەبین با ئەو گۆڕینەی بەسەردانەهێنین .

■ « الوهم = وێژنگ ، وڕێنە » .

شیکردنەوە :

ا ــ وهم : بریتیە لە تەسەوری شتێك بەبێ ئەوەیکە بەخواستی مەبەستێکی پیشەکیبێ .. دیسان گومانو خەیاڵو ئەندێشە ــ ش دەگرێتەوە .

ب ــ وێژنگ : بریتیە لە وەنەوز . فلانکەس وێژنگیدەدا(٥)

ج ــ وشەی ( وێژنگ ) گۆرانیبێ یان ئەردەلانی یان سەربە هەر دەستەشێوەیەکیدیکەبێ لە بێژەی « بێژنگ »ەوەیە؛ چونکە لە هەندێ ناوچەی شارباژێڕدا ئەم ئیدیۆمە بەکار دەهێنن : فلان بێژنگان دەکا = وەنەوزەکوتەیەتی و خەو دەیباتەوە . ئەم ئاوەڵواتایە لەو روخسارەکارە تایبەتیەوە دابەزیوە .. کەواتە بەهیچ جۆرێ وەهمو گومان ناگرێتەوە.

د ــ وڕێنە : ئەمیش قسەکردنە بەبێ هۆشیەوە . لە هەندێ ناوچەدا لەباتی وڕێنە قسەبزڕکاندن بەکاردەهێنن ، کە دەڵێن : فلانکەس (دەبزڕکێنێ = لەخۆیەوە قسە بەیەکدادەدا) مەفهومی ئەم زاراوەیەش بەهیچ کلۆجێك ناچێتە خانەی ( وهم ) ەوە .

هەرچۆنێبێ « وهم » بریتیە لە ــ خەیاڵە درۆزنە ــ و زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو دوو زاراوەیەدا ؟!.

ل ٣٠ * زانستیی نەفس *

لیژنە لەگەڵ وردبینیی خۆیدا زاراوەی « نفس » ی هەر وەك خۆی هێشتوەتەوە .. ئەوەی بە خەیاڵی ئێمەمانانیشدابێ، بەرێزان لەوسەریەوە هاتونەتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا باری بۆچونم هەیە : ــ

لەرووی ــ فقه اللغه ــ وە وشەی « دەروون ــ پەیوەندی بە واتای ( نفس ) ەوە هەیە کە باری شاراوەو نهێنیە .. کورد دەڵێ : ــ فلانکەس دڵو دەروونی باشە ــ ئەمە لە بارەنەفسیەکەو . نزیکە ، یان لەهەمان دەربازگەوە ( ئەندەروون = حرم ) لەکاردایە ئەویش شوێنێکی پەنامەکیە .. بەلام لەهەمان کاتدا کە بنووسین : ( نفس = دەروون ) بەرەنگری وشەی هاوبەش دەبینەوە ، چونکە ــ دەروونی = باطنی ــ زەقترە . ئەمەش لەبەر ئاڵۆزە زمانی باشناوەستێ(٦) .
کلۆکەمان نەبێتە چاولێکەری ، نەفسی عەرەبان بەملاولادا ملیناوە ، وەك : نفس = گیان ، ذات ، کەس ،

بارەدەروونی تایبەتی .. هتد . بۆ ئێمەش دەلوێ کە بنووسین: ( زانستیی دەروونی ، یان ـ دەروونناسی ) تاراددەیەکیش بەکارهاتوە .

**■ « اتجاه النمو = بەریانی فراژووبوون »**

لێرەدا لیژنە هونەرمەندانە هاتوەتە دەست بەتایبەتی وشەی « بەریان » کە کوردی واتەنیو سووکو خۆشە ، ئیدی لەمەولا بەرامبەر بە مەبەستی ـ اتجاه ـ دۆش‌دانامێنین ، واتا فەرهەنگیەکەشی ئەمەیە : « ڕێگوزاریی ئاو و با : بەریانی ئاوەکە یا باکەبگرە (٦) .

دیسان بەرامبەر بە « النمو » گەشەسەندن ، گەشەکردن، بەخۆداهاتن .. هەموویان لەکاردان . لێرەدا پێویستیمان بە تایبەنکاریو تخصیص هەیە . واتا فەرهەنگیەکەی « فراژوو » هەر گەشەکردنەکەیە .. بەلام بە پێی ناوچە چۆن دەگوترێ « فراژوو » دەشیگوترێ « فراژی » و ئەمیان خۆش‌گۆترە کەواتە بۆ هەمان مەبەستی زانستی لەجێی خۆیدایە بنووسین: « بەریانی فراژی » نەك ـ فراژووبوون .

**ل ٣١ : « اجهزة الرد ، اجهزة الاستجابة = رشتەی بەرتەك »**

**بەشوێن‌کەوتنێك :**

ـ رشتە : بەزازایی بۆ (گوریس ، هەرشتە ) لەکاردایە . لە فارسیدا : ریسید ، تابیدشدە. .(٧) لە کوردیی شێوەی ناوەڕاستدا بووەتە : رست : کە کەمەندو دەستبێنێکە دەهاویژرێتە قلیدەی تانجی . دیسان بەو گورزە سیرەی هۆنراوەیەش دەگوترێ کە وشەمبەرە ی پێ لە نێر دادەبەسترێ. پێ‌دەلێن : ـ رست ، رستە . رستە تووتنی لەشریت دراو = گورزە . هەروەها رستەمووروو ..

لەرووی وشەسازیەوە ، ئاوەلناوی بەرکارە لەسەر ڕێژگەی فارسی ، وەك : نوشتە = نووسراو ، رستە = رستراو .

لەرووی ئاوەل‌واتا ـ مجاز ) ەوە :

بەبێ‌ئەوەی سەرنجی ئەوەبدەین کە فۆنێمی | ش | یان [ س | لەبێژەی ـ رشتە ، رستە ـ دا کامیان بنجیە ـ لە بیچمو روخساری پۆپیو تەنافی ئەو ماددە تێك‌باهەل‌دراوەدا. زاراوەی رستە = رشتە / بۆ « جملە » و لێکدانی وشە . سازدراوەو لە دەستووری زمانی کوردیدا جێی خۆی کردوەتەوە . جا ئەگەر دروست‌بێ ( جیهاز ) بۆ (جملە) هەروەها بە پێچەوانەو لەجێی یەکدیدا بەکاربهێنرێن ، ئەوا زاراوەی ( رشتە = جیهاز ) ش لێرەدا دەسەلمێنین .؟!

دەبێ ئەوەش بەسەربکەینەوە کە هەندێ ، زاراوەی « کەلوپەل » و برێ ( ئامێر و ئامراز ) یان لە شوێن ( جیهاز ) بەکارهێناوە .. دیارە ئەوانە بێ‌ئاگابوون کە هەرکامیان بۆ شتێکی تایبەتیە وەك :

ـ کەلوپەل = اثاث ، ئامێر = ئالة ، ئامراز = اداة .. هتد ..

لەدوایدا زمان‌دۆستان بەپێی ئەرکو پێك‌هاتن ، زاراوەی « کۆئەندام » یان خستە گەڕو مەردومگەلەکە تا ئەندازەیەك قبوولیان‌کردو لە بەرنامەی خوێندندا ، خۆی چەسپاندوە دواتر لە دوو توێی فەرهەنگدا جێ‌گیربوو ، وەك : جیهاز عظمی = کۆئەندامی ئێسکی ، جیهاز هافرس = کۆئەندامی هاقەرس .. هتد(٨) .

دەبێ ئەوزاراوەیە بە ڕەهایی ڕەچاونەکرێ چونکە لە کارگێڕیو کۆمەلایەتیدا زاراوەیەکی چالاکترمان هەیە . وەك : « دەزگا » کە دەگوترێ : دەزگای میری = جیهاز حکومی ... هتد .

**■ « الاحساس بالحركه = هستی فڕکه »**

فڕکە ـ کوتومت ( حرکە = جوولە ) ناگرێتەوە . بەلکو ( فڕکە ) بۆ ( زیدە جوولە ) یە .. بەپێی ئەو دەقە ( بزووتنەوەی سەلت ) مان دەوێ .

ئەوەش باوە کە دەگوترێ : کەوتە لینگە فڕکە . فڕکەی بەستی .. هتد . وانە کوتوپڕانە پەلاماریداو خێرا بۆی جوولا . بنکەی « فڕکە » ش هەر لە فڕینەوە هاتوە کە لە خانەی بزووتنەوەی سووك‌چوستدایە . کەواتە پێشنیازدەکەم هەروەك ڕۆیشتودو هەلەش‌نیە بنووسرێ « هەستە جوولە .. یان هەستی جوولە » .

**■ « اختبارات الاتجاهات والميول = ئەزموونەکانی بەریانو وازان » .**

لەم شوێنەدا ( اختبار ) لە سنووری تاقی‌کردنەوە ـ دەرناچێ و لەمێژە چەسپاوە . وشەی ( ئەزموون ) کە پتر بەرەو فارسییەو لەوێدا زەقترە لە کوردیدا تەواو نامۆیە .

لەوەش بەئاگاین کە دەگوترێ :

ـ وازم‌لێیە ، وازم‌لێ‌نیە = مەیلم‌لێ‌نیە .. یان وازم‌لێ‌بێنە = بەخەم‌بەردە .. ـ ئەمیش لە سوورگەی (رغبة) دایە کە بە ( ئارەزوو ) جێ‌گیربووە . لە لایەکی دیکەشەوە زاراوەی ( وازی ، وازان ) لە گەمەو گالتەدا باوترن .

**■ « اختبارات استخلاص الحقائق = ئەزموونەکانی وەدەست‌هێنانی ڕاستیان.» .**

بەرلەوەی کە ناوی زاراوەی لێبهێنین ، دەقاو دەقێکی دارشتنە عەرەبیەکەیە ، پێشنیازدەکەم کە بنووسری « ئەزموونەکانی راستی‌وەدەست هێنان » .

■ **« الاختبارات التدريبية= ئەزموونەکانی راهێناه »**

لەرووی مەبەستەوە ، رەخنە لەوەدانیە کە « مەشق ، راهێنان = تدريب » لەکاردان .

بەلام بۆ تایبەتکاری‌و دابران، پێویستیمان بە بەراوردێك هەیە :

ئەم زاراوە عەرەبیانە بەربینگیان‌پێ‌گرتوین : تدريب ، مدرب ، مدرّب ، اسم مكان ، تمرين . .

ئەمانە بەچەپوراستدا ، لە کاری بیری‌و مەیدانی‌و وەرزشیدا بەیەکداهاتون . . لە کوردیشدا ئەم وشانە بەریان بۆ رەهابووە : ( رام‌کردن ، راهێنان ، مەشق‌کردن ، خایاندن).

ئەوەندەمان دەسەلاتە کە دەستێکی هونەریان تێوەردەین بەپێی شوێن‌و گونجان :

١ ـ لەکاری مەیدانیدا : ( تدريب ، تمرين = مەشق ) .
٢ ـ لە فێرکردن‌و کۆمەلایەتیدا : ( تدريب ، تمرين = راهێنان ) .
٣ ـ لە هونەرۆوەریدا : ( تدريب = رامکاری ) .
کەواتە پێشنیازدەکەم بنووسین :
ـــ الاختبار التدريبي = ئەزموونە رامکاری .
ـــ المدرّب الفني = رامکاری هونەری .
ـــ وحدة التدريب = لقی رامکاری ، راهێنان
ـــ الدورات التدريبية = دەورە رامکاریەکان .
ـــ التدريب العسكري = مەشقی سەربازی .
ـــ التمرينات لحل المسائل = راهێنانەکان .

■ **« اختبارات السمات الشخصية = ئەزموونەکانی سیماکانی کەسایەتی »**

١ ـ دەتوانرا بەرامبەر بە ( سمات ) سوود لەم وشەکوردیانە وەربگیرێت ، وەك : ( نیشانە ، روخسار سەکوت . . . »
دارشتنەکوردیەکە عەرەبی‌ئامێزە ، بەرای‌من بەم چەشنەی خوارەوە دەبێ : « ئەزموونەکانی سیماکەسیەکان » .

■ **« الاختيار = بژاردن »**

لە لاپەرە ـ ٣٤ ـ ە میشدا نووسیویانە : الاختيار المبدئي = بژاردنی گەلاله .
راموایە کە ( بژاردن )یش قبوول‌بکەین بنووسرێ : ( بژاردنەگەلاله ) دەنا نیسبەتی لێ‌هەلناسێ !! دوای دێریکی‌کە نووسراوە : ـ اختيار الوسائل = هەلبژاردنی هۆکان ـ . ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لیژنە وشەکەی بە لەقی داناوە . .

لەبۆچوونی خۆمەوە دەلێم : زاراوەی (اختيار) بەرەهایی‌و بەزاراوەی ( بژاردن ) ی رووت دابین‌نابێ . . بەلام لەهەندێ رووەوە بەزیدەی ـ هەل + . . دەگونجێ بژاردنی بەتەنی دەمان‌باتەوە بۆ مەبەستی « عد ». هەندێ جاریش (بژاردن) بۆ ـ دۆزین‌و جیاکاری بەکاردەبرێ ، وەك ( برنج بژاردن ).

■ **ل ٣٤ : « الإذلال = زەلیل‌کردن » .**

ئایا ناتوانین سوودلەم وشانە وەربگرین : (هێنانەژێرڕکێف بەرڕکێف‌کرن ، داماوکردن . .؟! ) .

■ **« الاساليب الجامدة = وشکە شێوازەکان » .**

لێرەدا بەپێویستی نازانم کە بەهەمان خوازەسازی بۆ ( وشك ـ وتەڕ ) بچین ، لەکاتێکدا کە ( وەستاو ) باشتر مەبەستەکە وەدی‌دەهێنێ کە بلێین ( شێوازە وەستاوەکان ) بەرامبەربە ( شێوازە بەکارەکان = الاساليب الفعالة ) .

■ **« الاستجابة التوقعية = رەدای بەرتەما »**

بەلای منەوە لیژنە چاکی پێکاوەو زاراوەکوردیەکە بەخواستی ئێرە ، پەسندە ، کورد دەلێ : ( رەدا لە ئافرەتەکە وەربگرن . . یان رەدایەنادا ) ئەم زاراوەیە با لەو تەنگەبەریەوە دابەزێ‌و تایبەتنەبێ بە رالێ‌وەرگرتنی ئافرەت = قایل‌بوون . دیسان ( بەرتەما ) بێتو لە ـ طمع ، طموح ـ یشەوە هاتبێ ، بەرامەی‌کوردی وەرگرتوە .

■ **« الاستدعاء = ورووژاندن » .**

ئەم زاراوەیە جێی تێرامانە ، چونکە « ورووژاندن » پربەپێستی « الإثارة » یە. ئیدی نازانم‌بە چ سەبارەتێك بۆ واتای ( الاستدعاء ) خراوەتەکار ؟!
ئەوەندەهەیە ئەگەر ( استدعای ئێرەو ـ اثاره ـ یەك‌وانابن ، ئەوا رێگەی رەخنەم‌نیە ! ) .

■ « الاستعداد = ئامادەیی » .

ئەگەر کار بەمەوەبوەستێ ، زاراوەکە بەجێیەو تائێستا رۆشنبیران بەکاریانهێناوە .. بەلام یەکسەر بەدوایداو بە ڕێزگەی تۆ نووسیویانە :

« الاستعدادات = تەیاریی » نازانم هۆی بارلێگۆڕینەکە لەبەرچیە ؟.. ئەگەر مەسەلەکە تاك و کۆیەتیبێ ، کارناکاتە سەر جەوهەری مەفهومەکە .

دیسان بەشێوەی تاکیش بایانداوەتەوە بۆ ( ئامادەیی ) و کردویانەتەوە بە ( تەیاریی ) . وەك لە هەمان ریزدا نووسراوە ( تەیاریی گشتی ) .

وشەکەی « تەیاری » تازەیە ، پێویستبوو شیبانبکردایەوە .. ئەگەر بشلێین با چەند وشەیەك بۆ یەك مەبەست بخەینەوە، بۆ هەمووشتێك پێ‌ملبم لەگەل ئەم کارەدانیم .

■ « اسس الخبرة = پاشخانی شارەزایی » .

چەند دێرێ لەمەوبەر نووسیویانە ( اسس = بنەما ) !! بەشیکردنەوەی ( پاش ) ئاوەلکار + پاشگری ( خان ) ئەم هەویرە ئاوزۆردەکێشێ و مەودای لەسەر رۆیشتنیم نیە .. بەلام بۆ لە زاراوەی « بنەڕەت » کە لەبارترەو چەسپیوە ، خۆمانبدزینەوە ؟!

■ « ل ٣٦ : اقصى حدود الاقتصاد = ئەوپەڕی پاشەکەوت».

لە رواڵەتی زاراوەکەوە وادەردەکەوێ « پاشەکەوت » کە لفێکی تایبەتی ـ اقتصاد ـ ە ، لەواتای ( اقصى حدود )ەکەوە دەردەچێ .. بەلام ناسەلمێنرێ ، چونکە نووسراوە : ـ

( ئەوپەڕ + پاشەکەوت ) . ئەمە ڕاستە کە ( توفیر = پاشەکەوت ) ئەوپەڕی ئابوریە ، کەواتە زاراوەکە پڕاوپڕی تەعبیرە عەرەبیەکە نیە بەلکو ئەنجامەکەیەتی کە پاشەکەوتە نەك ئەوپەڕی. بەکورتی بێتو دەستەواژە کوردیەکە بکەینەوە بە عەرەبی ئاوا دەردەچێ :

( ئەوپەڕی پاشەکەوت = اقصى حدود التوفير ).. وەك بلێین : ـ ئەوپەڕی ئابوری = اقصى الاقتصاد ..

ئەگەر مەبەستی لیژنە ئەوەبێ کە وازلەوشەی (ئابوری) بهێنین زاراوەی پاشەکەوت / ی بخەینە جێ،بەرای من کارێکی لەبارنیە ، سەردەمیکە نووسەران ئەم دووزاراوەیەیان بەکارهێناوەو سلیان لێناکەنەوە ، وەك :

ـ اقتصاد = ئابوری

ـ توفیر = پاشەکەوت = بەزمەندەکردن .

■ « الانفعال = تاوگیری » .

ئەم زاراوە نوێباوەو بۆ ئەو واتایە بەلای منەوە ڕەسەنەو پێشوازیلێدەکرێ .. تائێستا ( انفعال = هەلچوون ) لە نووسینماندا ، باوبووە ، بەلام ـ هەلچوون = هیجان ـ لەبارترەو لیژنە پێکاویەتی .

■ « الجناح = لاساری » .

وشەی لاساری = سەهەندەیی بۆ مەبەستی ( مشاكسة) چەسپاوەو هەلەشنیە ، دووریشنیە کە هەر گوناهەکەی لەمەڕ خۆمانبێ و پەڕیبێتە عەرەبیەوەو کردبێتیان بە ( جناح ) !!

هەرچۆنێبێ کورد دەستبەرداری گوناح = جناح نابێ و گوناحیشی بە لاساری نایەتە زەینەوە .

■ « دائرة المعارف = زانیارستان »

زاراوەیەکی ڕاستو خۆش‌ئاوازە ، لیژنە پێکاویەتی .

ئیدی ئاواتەخوازین ڕۆژێ‌لەڕۆژان بە زانیارستانی لەمەڕخۆمان تینوێتیمانبشکێ .

پەراوێزەکان :

١ ـ زاراوەی پارێزگای سلێمانی چ ١٩٧١ : الضبط = دابینکردن ، خۆڕاگرتن ..

٢ ـ فەرهەنگی خال جزمی دووەم چ ١٩٦٤ .

٣ ـ فەرهەنگی عەمید : قضیەای کە محتاج ببرهانو دلیلباشد ..

٤ ـ زاراوەی زانستیی کوردی / نەقابەی مامۆستایان چاپی ١٩٦٠ .

٥ ـ فەرهەنگی خال جزمی سێیەم چ ١٩٧٦ : ( ویژنگ = وەنەوز ) ..

٦ ـ ئەگەر لافیئەوە لێبدەم‌کە نابێ زاراوەی هاوواتای کوردی ببێ ، ئەوە بەگشتی سەرناگرێ بەلام باری زانستیی و هونەری لێبخەینەکار ، دەیاندەینەکرێ . وەی «بەریان» نوێباوە ، بۆ ( فەرهەنگیخال ) .

٧ ـ فەرهەنگی عەمید : ریسید ، تابیدشد = رشتە .

٨ ـ فەرهەنگی زانیاری ( ع. ئی . ك)« کمال جلال غریب چاپی ١٩٧٩ .

کۆتایی



# بنەماکانی دیمانەی پەرەسەندن

فەرهاد پیرباڵ

**تێبینی**

بە پێویستمان زانی ئەو زاراوانەی لەم نووسینەدا دەکەونە پێش چاوی خوێنەر ، پێشەکی ئیشارەتیان پێبدەین ، نەك بکەونە دوای وتارەکەوە وەك برای نووسەر دانابوون .

**« کاروان »**

- **دیمانە : تیوری ، نظریة .**
- **پاشماك : وراثة .**
- **ژینگە : دەوروبەر ، بیئـة .**
- **شانە : خلیە .**
- **فراژووبوو : رەسیو .**
- **تیوریی بازدان : نظریة القفزات .**
- **خاسیەتە پەیاکراوەکان : الخصائص المکتسبة .**
- **زۆرانبازیی مانەوە : الصراع من اجل البقاء .**
- **هەڵبژاردنی سێکسی : الانتخاب الجنسی .**
- **هەڵبژاردنی سروشتی : الانتخاب الطبیعی .**

**هیچ دیمانەیەکی زانستی بەقەد ئەوەکەی داروین ، مشتو مڕی بەردەوامو دەمەقاڵێی لەبن نەهاتووی لەسەر نەکراوە.. تەنانەت تا ئێستەش لەبواری لێکۆڵینەوەی ئـەنترۆپۆلۆجیو کۆمەڵناسیداو لەنێو نێوەندە ڕۆشنبیرییەکاندا خاوەن بایەخێکی ئەوتۆیە کە لەبڕانەوە نایەت .**

بایەخی هەرە دیارو گرینگی دیمانەی پەرەسەندن لەپاڵ بایەخە زانستییەکەیدا بایەخە فەلسەفییەکەیەتی ، چونکە بەبێ تێگەشتن لەم دیمانەیە ناتوانین لـە فەلسەفەی ماتەریالیزمی دیالەکتیکیو تەنانەت لەمەسەلە سەرەتاییەکانیشی تێبگەین . لەڕاستیشدا دیمانەی پەرەسەندن ـ Thiory of Evolution زۆر هانی چەسپاندنو بەرەوانیشاندانی بـیری ماتیریالیزمی دیالەکتیکیداو جەزرەبەیەکی قورس بوو درا لـەبۆچوونی نازانستیو میتافیزیقیانەی چەوت کەتا سەردەمی خۆیشی هەر باوبوو .

کورتەی ئەم دیمانەیە لەوەدایە کە گشت گیـانەوەرانو بەمرۆڤیشەوە ، پێوەندییەکی مێژوویو بایۆلۆجیو پاشماکییان لەنێوانیاندا هەیەو تێکڕا لەئاکامی گۆڕانو پەرەسەندنێکدا پەیدا بوون کە ملیۆنەها ساڵی خایاندووە . واتە ئـەو چەشـنە گیانەوەرە فراژووبووانەی کە هەنووکە دەیانبینین لـەڕابردوودا وەها نەبوون وەك ئێستە دەیانبینین، بەڵکوو لە زنجیرە ڕەسەنێکی دیارکراوەوە هاتوون کەئەمانیش لە زنجیرەیەکیدیکەوەو تـا دەگاتەوە گیانەوەرەیەك خانەییەکان بەم شێوەیە بەپێی زانستەو دیمانەی پەرەسەندنی زانستیی ژیان ، ژیانی تێکڕای گیانەوەران لەو زیندەوەرە یەكشانەییانەوە دەستی پێکردووە پەرەی

سەندوە(*) کە پەرەسەندنەکەش وەك داروین دەڵێ : هەمیشە لە بێهێزەوە بۆ بەهێزو لە ناتەواوەوە بۆ تەواو هەنگاوی ناوە.

**داروین ١٨٠٩ – ١٨٨٢** لەم دیمانەیەیدا وەك چۆن بیخی زیندەوەرانمان بۆ پێشان دەداو پرۆسیسی پەرەسەندنو جۆرلێکەوتنەوەمان بۆ رۆشن دەکاتەوە ، وێرای ئەوەش چەند پاساو بنەمایەکی دیمانەییمان بۆ دەستنیشان دەکا .. ئەمەش دوای کەڵك وەرگرتنێکی زۆری لەبیری کەلەفەیلەسووفو دانایانی پێش خۆیو هەروەها لە دەسکەوتەکانی زیندەوەرزانیو زانستیی چینەکانی زەویو زانستیی شێوەکانی رووەكو لە تێبینییەکانی خۆی کە لە گەشتەکەی « بیگل »یدا تۆماری کردبوون .

دەتوانین دیمانەی پەرەسەندن بە کورتی لەم چەند بنەما سەرەکییەدا بنوێنین :

**١ – پاشماكو ژینگە :**

زیندەوەر لە گشت پلە جۆر بە جۆرەکانی پەرەسەندنیدا ، خاسیەتەکانی دایكو باوکی هەڵدەگرێ ، یان بە شێوەیەکی دیکە: لە ئەوان دەچێ .

ئەم خاسیەتانەش هۆی مانەوەی بەرەبابی بوونو دەرفەتی مانەوەو ژیانی زیندەوەرە تازەکەش دەدەن، تا بەم خاسیەتانە بتوانێ خۆی لەگەڵ هەمان ئەو ژینگەیەی بەرەبابی بگونجێنێ . جێگەی سرنجە کە ئەم خاسیەتو سیفەتانەی بوونەتە «پاشماك» تێیدا، لە رێگەی کرۆمۆسۆمو جینەکانی لەشو شانەکانیانەوە هەڵگیراونو لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەی دیکە دەگوێزرێنەوە .

ئەدی ئەگەر ئەم زیندەوەرە کەوتە ژینگەیەکی جودا لە ژینگەی کۆنی ، یان بەواتایەکی دیکە .. ئەگەر کاتێك گۆڕان بەسەر دەوروبەرەکەیدا هات !؟؟. بێگومان لەو تەرزە بارو دۆخەدا، وەك چۆن لە لێکۆڵینەوەکانی پەرەسەندنی گیانەوەراندا دەرکەوتووە، ئەو گیانەوەرە ئەگەر بێهێز بووبێ لە ئاست گۆڕانە تۆبۆگرافیی ئاوو هەوایییەکەدا، ئەوا فەوتاوەو ئەگەریش خاوەن بڕستەو توانست بووبێ، ئەوا ناچاربووە کە پلە بەپلە خۆی بگۆڕێو رووازاوو خاسیەتەکانی کۆنی بەلاوە بنێو هیدیکە پەیدا بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی بگونجێنێو لەگەڵ دەورو بەرە تازە سەختەکەدا هەڵ بکات . ئەم گۆڕانەش لە خاسیەتو ئەندامەکانیدا هەتا زووترو پتەوتر بووبێ، رادەی توانستی زیندەوەرەکە زێترو چێتر بووە بۆ مانەوە لە ژیاندا . بۆ نموونە [ماسی] کە گیانەوەرێکی ئاوییە، هیچ پێویستییەکی بە «قاچ» نەبووە، بەڵام کاتێ چەشنێك یان کۆمەڵەیەك لەو ماسییانە،



لە ترسی مردن لەدەست گیانەوەرانی لە خۆیان بە هێزتر هاتنە ناو لیتاو زەوییە وشکاییەکان، ئەو کاتە ناچاربوون کە [قاچ] پەیدا بکەن، چونکە ئەو قاچ پەیداکردنە مەرجێکی بنەڕەتی بوو بۆ مانەوەیان، تا بتوانن بەو خاسیەتەیان خۆیان لەگەڵ ژینگە وشکاییەکە بگونجێنن . بۆ نموونە : سەیری گیانەوەری [لامبرێنسۆدۆنت] بکە کە لە پاشاندا وشکاوەکییەکانیان لێ کەوتەوە .

**لێرەوا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە گۆڕانی نێوەندە ژینگەییەکە تا چ رادەیەك رۆڵو کاریگەرێتی دەنوێنێ لە بواری گۆڕانو پەرەسەندنداو هەروەها لە بواری دیارکردنی پاشماكو خاسیەتەکاندا؟ . واتە خاسیەتە جۆراو جۆرەکان لە ئەنجامی جودایی نێوەندە ژینگەییەکاندا پەیدا دەبنو دەبنە پاشماك، لەو وەچانەوە دیسانەوە دەگوێزرێنەوە بۆ وەچەیەکی دیکە . بەمەش دوای بەسەرچوونی ماوەو مەودایەکی مێژوویی، وەچەیەکی نوێو تارادەیەك جودا لە ئەوی پێشی پەیدا دەبێ .. رادەی جوداییەکی هەست پێکراو کە تەنانەت بینەر وا هەست دەکات بە تەواوەتی دوو چەشنی سەربەخۆن، کەچی لە راستیدا لەیەك چەشنو لەیەك نەژادەوە هاتوون .. وەك ئەوەی لە نێوان [کەر] و [ئەسپ]دا دەبینین کە کەر وەك وەچەیەکی تازە لە ئەسپەوە کەوتۆتەوە .**

کەوابوو شتی جەوهەری لەم بۆچوونانەدا ئەوەیە کە پاشماك لەژێر دەسەڵاتی خاسیەتی پاشماکیدا بە شێوەیەکی رەها رۆڵ نابینێ، بەڵکو ئەمە بەشێوەیەکی نیسبی هەیەو زێتر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کارلێکردنە هاوبەشە دیالەکتیکییەکە، لەگەڵ ئەو نێوەندە ماددییەی کە گیانەوەرەکەی تێدا دەژی(١) .

شایانی باسە کە ئەم راستییانە بەپێی بارو دۆخی دیارکراوو هەلو مەرجی تایبەتیی، لەگەڵ دنیای رووەکەکانیش پێکەلێتێك دەبنەوە، چونکە ئاشکرایە کە توانستی خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەردا، خاسیەتێکی پاشماکییەو. تایبەتە بەگشت بوونەوەرێکی زیندوو، تەنها هێندە هەیە کە رادەی ئەم توانای خۆگونجاندنە لە گیانەوەرێکەوە بۆ گیانەوەرێکی دیکە دەگۆڕێ .. هەندێکیان زوو بە پلەیەکی باڵا خۆ دەگونجێنن، بەڵام ئەوانی دیکە درەنگترو بە پلەیەکی نزمتر خۆ دەگونجێنن . بە بەرەوا پێشاندانی ئەم بۆچوونانەماندا وا دەردەکەوێ کە ئەو تیورە کۆنانەی هۆو سروشتی [پاشماك] بە لێکدابڕاوی

بێ پێوەندی دادەنێن، ڕاست نین‌و دوورن لە پێکەڵپێك بوونەوە لەگەڵ واقیع، بەدەردی [تیوریی بازدان](**) ئاسا لە پەرەسەندنە پلە پلەیی‌یەکەو لە یاسای گۆڕانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی دوورمان دەخەنەوە، چونکە «تیوریی بازدان» وەهای لێك‌دەدایەوە کە چەشنە نوێ‌یەکانی زیندەوەر کت‌وپڕو لە ڕێگای بازدانێکی لەناکاو پەیدا دەبن .. ئەم چەشنە نوێ‌یەش لە ئەنجامی گۆڕانە لەنکاوەکەدا بە سروشتی خۆی جودا دەبێ لەگەڵ نەژادی خۆی(٢).

بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونە هەڵەیەوە، بۆچوونە ڕاستەو زانستی‌یەکەی گۆڕان هۆیە ڕاستەقینەکانی دروست‌بوون‌و گواستنەوەی پاشماکان پێ نیشان دەداو هیچ لە بنەما یاساییەکەی گۆڕانە چەندایەتی‌یە دیالەکتیکی‌یەکە دوورمان ناخاتەوە، جگە لەوەش گۆڕانکاریەکە دەبەستێتەوە بە بنەما دیمانەییەکانی دیکەی پەرەسەندنەوە .

## ڕێبازی لامارك

وەك ئاشکرایە «لامارك»ی زانای فەڕەنسیش، هانی پێشکەوتنی کێشەکانی گۆڕان‌و پەرەسەندنی بایۆلۆجی‌ی زۆر داوەو ڕۆڵێکی گرینگ‌و بایەخداری گێڕاوە لە لێکدانەوە زانستییەکاندا لەبارەی سروشت‌و پاشماکو پەرەسەندنەوە . بنەما بنجی‌یەکانی ڕێبازی لامارك لەم دوو یاسایەدان :

### ١ ـ یاسای خاسیەتە پەیاکراوەکان

ئەم خاسیەتانە لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەی دیکە دەگوێزوێنەوەو لە بنجدا بەبڕوای لامارك لە ئەنجامی کاریگەرێتی‌ی دەورو بەرەکەدا پەیدا بوون . بەمەش ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە کە ئەو گۆڕانەی بەسەر زیندەوەرەکانداو بەسەر چۆنێتی‌ی خاسیەتەکانیاندا دێت، ئەنجامی گۆڕان‌و کاریگەرێتی‌ی ژینگەو نێوەندە مادديیەکەیەو گۆڕانی زیندەوەرەکەش لەسەر بنەڕەتی خۆگونجاندنە لەگەڵ ژینگەکەیدا . بەم شێوە لای لامارك خاسیەتە پەیاکراوەکان ئەگەر ئامرازێك نەبن لەبواری گۆڕانکارییەکاندا ئەوا خاوەن بایەخێکی مەزنن ... (٣).

### ٢ ـ یاسای بەکارهێنان‌و فەرامۆش‌کردن :

بەپێی بۆچوونی لامارك، بەکارهێنانی ئەندام ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە پەرەسەندن‌و بوونی ئەو ئەندامەدا . هەروەها فەرامۆش‌کردنی دەبێتە هۆی لەنێو چوونی. ... واتە ئەوەی



[ پەرەسەندنی قاچی ئەسپ ]

کە بڕیار بەسەر مانەوەو پەرەسەندنی ئەندام، یان لەناوچوونیدا دەدا .. ڕادەی پێویستی‌ی گیانەوەرەکانە بەو ئەندامانەیان .

ئەمجا ئاکامی ئەوە هەرچی بێت ـ ئایا مانەوەو پەرەسەندن‌بێ، یان فەوتان‌و لە نێوچوون ـ خاسیەتەکە دەبێت خاسیەتێکی بایۆلۆجی‌و لەو وەچەیەوە بۆ وەچەی دیکە دەگوێزرێتەوە، بۆنموونە : ئەو گیانەوەرانەی کە لە ئەشکەوتەکان‌دا لە تاریکییەکی ئەنگوستە چاودا دەژیان، لە ئەنجامی فەرامۆش‌کردن‌و پێویستی پێ‌نەبوونی چاویاندا .. لەگەڵ ڕابووردنی سەردەمە مێژووییەکان ، لە ئەشکەوتەکان‌دا چاویان کوێرایی داهاتووە .. وێڕای ئەمەش ئەندامە هەستکارەکانی دیکەیان بەهێزتر بووە، چونکە بەکاریان هێناون‌و پێویستیان پێ‌بوون .

نموونەیەکی بەناوودەنگتریش کەلامارك بۆ بەڵگەی یاساکەی هێناویەتیەوە، ملی زەرافەیە کە درێژی‌یە نائاساییەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم گیانەوەرە هەر لە کۆنەوە بژیوی لەسەر گەڵای درەختە بەرزەکان بووە .. هەمیشە ملی بۆ گەڵای درەختە بەرزەکان ڕادەکرد بۆ خواردن .. بەمەش هێور هێورو قۆناغ دووای قوناغ درێژیی بڕبڕەکانی ملی زێتری دەکرد .. ئەم خاسیەتە بایۆلۆجی‌یەش بووە پاشماکێك‌و گوێسترایەوە بۆ وەچەکانی دیکەشی .

### ٢ ـ زۆرانبازیی‌مانەوە :

داروین لە ئەنجامی بیروڕاکانی ـ مالتۆس‌دا(***) گەیشتە ئەو ڕاستی‌یەی کە ژمارەی گیانەوەرانـ هەموو توخم‌و چەشنێك کە لەسەر زەوی هەن بەگوێرەی یەك بەدووای یەکی ئەندازەیی : ٢ ، ٤ ، ٨ ، ١٦ ، ٣٢ ، ...

دەکەن . واتەگیانەوەران بەشێوەیەکی ئێکجار خێرا زیاد دەبن‌و ژمارەیەکی ئێکجار زۆرو لەڕادە بەدەر کە لەولای تێبڕ کردنی خەیالی مرۆڤە، فەرخەو بێچووان بەرهەم دێنن . ئەمەش ئەگەر بەردەوام بێ‌و بەدرێژایی ژین گشتیان هەر بمێننەوە، بەتەواوەتی هەموو سووچ‌و ئەرەیەکی زەمین داگیر دەکەن‌و جێگەیان نابێتەوە، ئەوساش دنیاو ژیان دەبێتە پەرجوویێکی گەلەك سامناك .. بەلام نەخێر .. هێزەکانی سروشت دەرفەتی ئەمە نادات‌و ناهێلێ لەنگەری چەشنەکانی گیانەوەر لەبواره جۆر بەجۆرەکاندا تێك‌بچێ، ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ ـ چەشنەکانی گیانەوەران، بگرە گەلێك لە تاکەکانی یەك چەشنیش لەگەڵ یەکدی، لە ڕووی خاسیەتەوە وەکویەك نین‌و جوداوازییان لەگەڵ ئێکدی هەیە، وەك چۆن دەبینین : لاواز هەیە .. بەهێز هەیە .. بەهێزتریش هەیە . واتە هەر یەکەو هەر چەشنە تایبەتمەندێتی‌ی خۆی هەیە . لەبەر ئەوە دەبینین ئەم تایبەتمەندێتی‌یە لە خاسیەتەکانی گیانەوەرێك‌و جودایی لەگەڵ ئەوی دیکە ، دژایەتی‌و ناکۆکی‌یەکیان لەنێوان بۆ دروست دەکا کە ناکۆکی‌یەکی غەریزیی توندو تیژەو جەوهەری زۆرانبازی بۆ مانەوە لێك‌دەداتەوە .

٢ ـ واتە گیانەوەران ـ چەشنەکان، سەبارەت بە بژیو پەیداکردن‌و خۆژیاندن لەگەڵ ئێکدی تەبا نابن، هەریەکەی دەیەوێت لەسەر ئەوی دیکە بژیت، چونکە ژمارەیان زۆر زۆترن لەڕادەی ئەو بژیوانەی کەمانەوەو ژیانیان بۆ مسۆگەر دەکەن، جگە لەمەش کارای سەرەکی ئەوەیە کە هەر گیانەوەرێك تایبەتێتی‌یەکی هەیە کە بەهۆیەوە بەسەر گیانەوەرێکی‌دیکەدا زاڵ دەبێ‌و لەناوی دەبا .

بەم شێوەیە زۆرانبازیی مانەوە وەك ئەنجامێکی حەتمی لەنێوان گیانەوەرانی سروشتدا بۆ زێتر توانست پەیاکردن پەیدا بووەو هێزەکانی سروشت بەمە هەوڵی لەنگەرگرتنی نێوان چەشنەکانی زیندەوەر لەبواره جۆربەجۆرەکاندا دەدەن(٤) . وەك زانیمان دەورو‌بەر ڕۆلێکی کاریگەر دەبینێ لە دیارکردنی خاسیەتەکانی گیانەوەردا، هەر لە دیارکردنی ڕوواڵەو بێ‌هێزی‌و بەهێزییانەوە هەتا چۆنێتی‌ی پێکهاتنی لەشیشیان ... ئەم سیفەت‌و خاسیەتانە دەبنە پاشماکیان‌و لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکەیان دەگوێزرێنەوە .. واتە جودایی نێوەندە ژینگەییەکە دەبێتە هۆی جودایی لەنێوان چۆنێتی‌ی گیانەوەرانی ئەو دوو نێوەندە کەهەر بەو جوداوازییەشەوە لەدایك دەبن .

ئەم جواداوازییانە لەڕووی خاسیەتەکانی گیانەوەرانەوە، بەشێوەیەکی گەلەك کاریگەر زیان بەهەندێکیان، یان کۆمەڵەیەکیان دەگەیەنێ‌و لەنێویان دەبات، ئەوانی دیکەش دەبووژێنێتەوەو لە شەڕە گەرمەکەی زۆرانبازیی‌مانەوەدا وەسەریان دەخا . بۆ نموونە پشیلە بەهۆی خاسیەتە تایبەتییەکانی، لەڕووی بەهێزی‌و خێرایی پەلاماردان‌و تیژیی چڕنووك‌و دانەکانی‌یەوە، لەگەڵ مشك جودایەو هەمیشە ئەم خاسیەتانە زاڵی‌کردووە بەسەر مشك‌و لەزۆرانبازییەکەدا وەسەری خستوە . بەمەدا دەردەکەوێ کە گیانەوەر لەپێناو بەرگری‌و مانەوە، یان سەرکەوتن لەم زۆرانبازیی مانەوەیەدا، هەوڵ دەدەن ئەندامەکانیان : ئەو ئەندامانەی کە یاریدەدەری مانەوەو پەرەسەندنیانن، بەهێزترو پتەوتر بکەن . تەنانەت جاری‌وا هەیە گیانەوەرەکە لەبۆ مانەوەو درێژەپێدانی ژیانی خۆی، بەتەواوەتی کۆئەندامێکی تازە پەیدا دەکات(٥) .

شایانی‌باسە کە شێوە بنەڕەتی‌یەکانی خۆگونجاندن، کەمانەوەی گیانەوەرانی زامن کردووە، ئەم شێوەیانەبوون(٦):
**ا ـ خۆگونجاندنێکی نموونەیی لەگەڵ بارودۆخەسروشتی‌یەکەدا (وەك چۆن لای حوشترو ورچەکانی دۆنی باکوور دەبینین) .**

**ب ـ گۆڕان، یان بوون بە گیانەوەرێکی بەهێزو نێچیرخۆر (وەك پلنگ‌و شێر) .**

**ح ـ پەیداکردنی توانست‌و فێڵ بۆ زووخۆشاردنەوەو ڕاکردن لەدەست دوژمن (وەك سمۆرەو کەروێشك) .**

**د ـ شێوازە جۆراوجۆرەکانی دیکەی هاریکاری‌کردن‌و دابەش‌کردنی‌کار . چونکە ژیان‌و ئارەزووی غەریزی‌ی گیانەوەران بۆ مانەوە، تەرزە پێوەندی‌یەکی نوێ‌ی هاریکاری‌کردنی لێ‌داواکردن کە لەتوێ‌ی ئەمەشەوە چەند چەشنێکی تازە لە گیانەوەران هاتنە ئاراوەکە دژمنایەتی لەگەڵ یەکدی نەکەن‌و هەندێ چالاکی‌ی هاوبەش لەگەڵ یەکدی‌و لەناو یەکدیدا سەقام بگرن .**

زۆرانبازیی مانەوە دیاردەیەك نیە تەنها لە ئاست چەشنەکان‌و بەس ، بەڵکوو ئەم زۆرانبازی‌یە لەنێوان گیانەوەرە هاوچەشنەکانیش‌دا ( ئەوانەی سەر بە یەك چەشنن ) ڕوودەدا کە ئەم تەرزەیان سامناکتریشە .

ئەم جۆرە زۆرانبازی‌یە ، یان لەنێوان دوو [ نێرە ] لەپێناوی مێیینەیەکدا ڕوودەدا ، تا یەکێکیان لەنێو دەچێ‌و ئەوی دیکەیان بەمێینەکە دەگات کە ئەمەش ناونراوە «هەڵبژاردنی سێکسی»و لەبنەڕەت‌دا ئەمیش هەر هۆیەکە بۆ لەنێوبردنی بێ‌هێزو لاوازەکەو درێژە پێدانی ژینی بەهێزەکەو پەرەسەندنی .

وەیانیش هەمان تەرزە زۆرانبازییە گۆڕینەکەیە ، بەواتای بۆ بژیوپەیا کردن‌و بۆ مانەوە .

داروین لە کتێبەکەیدا مانگا کێوی‌یەکانمان بە نموونە بـۆ دەهێنێتەوە کە چۆن لەپێناوی خۆراکو بژوێنـــدا بەیەکـدا هەڵدەپژێنو خوێنی ئێکدی دەرێژنو لەئاکامدا بەهێزەکەیان دەسەڵات بەسەر بژوێنەکەدا دەگـــرێو بێ‌هێزەکـــەش بەتێك شکاوی‌و بەژموردەیی مردار دەبێتەوە .

ئەم زۆرانبازیەی مانەوە ، زۆر بە ئاشکرا لە دەوروبەرە ڕووەکیەکانیشدا لەنێوان ڕووەکدا بەهەمان شێوەو لەسـەر هەمان هۆو یاسا ڕوودەدا . ئەگەر بشمانەوێ لە دنیای ڕووەکو ڕووەکزانیدا ئەنجامگریی ئەزموونو پێکەلێپێکبوونەوەو یاساو گەواهییەکان بکەین لەم ڕووەوە ، ئەوا زانایانی ڕووەکناس لە توێ کتێبو سەرچاوەکانیاندا زۆر بە ڕوونی‌و بەزانستییەوە ئەم ئەزموونو یاساو پێکەلێپێك بوونەوەیان بۆ پەنجـــــە نوماکردووین . هەروەها داروین خۆشی بەشێکی تـەواوی کتێبەکەی بۆ ئەم لایەنە تەرخان کردووە .

وێرای ئەم بۆچوونانە وا دەردەکەوێ کە داروین لەمـەڕ سەرتاپای زۆرانبازیی مانەوەی گیانەوەراندا ، سێ چەشـــنە زۆرانبازیی بۆ دیارکردووین :

**١ ـ زۆرانبازی‌یەك لەگەڵ هێزەکانی سروشتدا .**
**٢ ـ زۆرانبازیی نێوان چەشنەکان .**
**٣ ـ زۆرانبازیی نێوان تاکەکانی نێو یەك چەشنی گیانەوەر لەگەڵ یەکدی .**

**ئەم زۆرانبازییەی مانەوە ، هەر لەسەرەتاکانی پەیدابوونی ژیانو ڕۆژگاری زیندەوەرە یـــەك خانەییەکانەوە ، ڕۆڵو کاریگەرێتیی خۆی لەگۆڕانو پەرەســـەندنە بایۆلۆجییەکەی زیندەوەراندا نواندووەو لەتوێی ئـــەم زۆرانبازیـــەوە هەڵبژاردنێکی سروشتی ڕوویداوە کە ڕێگەی بە بەهێـــزو خۆگونجێنەکان داوە لە ژینگەکەدا بمێننەوەو بژین .**



سەرای ئەمەش گەلێك پێشهـاتی ژیانـەکی‌و هەنگاوی گۆڕانی بایۆلۆجیی گرینگ، ئاکامی ئـەم زۆرانبازیە ـ ئـــەم یاسا بایۆلۆجییە ـ بوون . بۆنموونە : ئەگـەر ئەو ناکۆکی‌و زۆرانبازیی مانەوەیە لە ژینگە ئاوییەکاندا نەبووایە ، ماسییەکان هەرگیز تووشی ترسی لـەنێو چوونو جێ پێ تـەنگ بوون نەدەهاتنو لەوانە بوو هەرگیز ڕوو لەدەرەوەی ئاو (وشکایی) نەکەن کە بەمەش وشکاوەکییـەکان پەیـدا نەدەبوونو پەرەسـەندنەکە دەوێستا هەروەها ئەگەر هەمان ئەو زۆرانبازییە بایۆلۆجییە لەنێوان خشۆکەکانی سەر زەمیندا نەبووایە، هیچ کۆمەڵەیەك لەم خشۆکانە قـەت ترسی قڕتێکـەوتنو لەنێو چوونیان لێ‌نەدەنیشتەو بۆمانەوەی خۆیان بەسەر درەختەکاندا هەڵنەدەگەڕان، لەوێشرا فێری قەڵەمبـازو بـازدانو فڕکێ فڕکێی لەم لقەوە بۆ ئـەو لقـەدار نەدەبوونو فڕنـدەکانیش پەیا نەدەبوون . تەنانەت ئێستەش ئەگـەر سـەیری قرژاڵ بکەین، ئەم گیانەوەرە ئاوییەلاوازە، لەبەر سستیی خۆی‌و لەترسی لەنێو چوونی خۆی، بۆ مانـەوەو بژیو پەیـداکردن دەریای جێ‌هێشتووەو هـاتۆتە وشکایی‌و لەنێو کێڵگەکـاندا دەژی . یا بەپێچەوانەشەوە، هەندێك لـە وشکاوەکییەکانی وەك گیانەوەری «دۆلفین» دووبـارە خشاونەتەوە نێو دەریاو سی‌یەکانیان گۆڕیوە بۆ کەوانەی ڕیشەدار .

جگە لەمـانە زۆرانبـازیی مانـەوە ڕۆڵێکی کاریگـەری لەدیارکردنی هەڵبژاردنی کاتدا بۆ ژیان لەلایەن گیانەوەرەوە هەیە، تەنانەت هەندێ گیانەوەری بەتەواوەتی ناچار کردووە کە بەتەنها شەوان دەربکەونو بەس، وەك : شەوگەڕەکان . هەروەهـا ڕۆڵێکی گرینگ لەڕووی دیـارکردنی خـاسیەتـە بایۆلۆجیەکانو دیارکردنی سیماو ڕوواڵەکانیشیان دەگێڕێ ، بۆ نموونە : ئەو ورچانەی کە لە دۆنی باکووردا دەژین، ڕەنگی تیسکەکانی لەشیان گۆڕانـدووە بۆ ڕەنگی سپی، بۆ ئەوەی هەر کە لەسەر بەفر یان لەنێو بەفردا ڕاکشانو خۆیان ونکرد، یان نوستن .. ڕەنگیان لەگەڵ ڕەنگی بەفرەکە تێکەڵ ببێ‌و بۆ دژمنو درندان نەناسرێنەوە .

بەم شێوەیـە دەردەکەوێ کە هـەموو گـیانەوەرێك لە زۆرانبازێیکی هەمیشـەیی بەردەوامـدا بووە لەپێناو مانەوەی خۆیدا . ئەم زۆرانبازی‌یەش جۆرلێ‌کەوتنەوەی چەند چەشنێکی دیکەی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە ئاراوەو لەسەر هەمان یاساو بە هەمان شێوە زۆرانبازی‌و پەرەسەندنەکەی ئیدامە پێ‌داوە .

## ٣ ـ هەڵبژاردنی سروشتی

لەدوو بنەماکەی پێشوودا ئەوەمان بۆ سـاغ دەبێتەوە کە :ـ

ا ـ هیچ چەشنە گیانەوەرێك لەسەر ڕووی زەوی نیە ـ ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت ـ بەبێ گیانەوەرەکانی دیکە بژیو هەر چەشنێك ئەگەر دوورەپەرێزو دوور لەنێوەندە زیندەوەرییەکاندا بژی ، دەبێتە خۆخۆرو لا و بەری خۆی ، چونکە ئەوەی ئەم پێویستێتی لە زیندەوەرانیدیکەدا بەدی دەکرێ . بەم شێوەیە زیندەوەران دەبێ لەنێویەکدیداو لەسەر ئێکدی بژین .

ب ـ هەر چەشنێك لەو زیندەوەرانە جودایی‌یەکی تەواوی لەگەڵ چەشنەکانی دیکەدا هەیە (تەنانەت لەنێوان تاکێکیشیان لەگەڵ تاکێکیدیکەی نێو هەمان چەشن)و جودایی‌یەکەش لە چەند خاسیەتو جۆێکەرەوەیەکدا دەردەکەوێ کە چۆنیەتیی خۆراکو چۆنیەتیی دەوروبەرەکە بۆیانی دروست کردووە کە هەر ئەم جودایی‌و ناکۆکییانەشن دەبنە هۆو کاری پەرەسەندنەکە . بەواتایەکی دیکە : هەندێك لەم گیانەوەرانە خاوەنی هێزو خاسیەتی چاکن کە بە هۆیانەوە چێتر لەگەڵ دەوروبەردا خۆ دەگونجێننو پتر توانستی خۆزاڵکردنیان بەسەر زیندەوەرانو سروشتدا دەشکێ . بەمەش دەرفەتی مانەوەو ژیانیان چێترو باشتر بۆ دەرەخسێ لەبواری پەرەسەندندا . بەڵام کۆمەڵەیەکی دیکە لەم گیانەوەرانە خاوەنی خاسیەتی خراپو بێهێزن، توانستی بەرگریکردنو خۆگونجاندنیان لە زۆرانبازیی مانەوەدا نیەو لەنێو دەچنو هێور هێور ژمارەیان کەم دەبێتەوە، یان هەر نامێننن . بەم بۆچوونەش وا دەردەکەوێ کە قڕتێکەوتنو لەنێو چوون ئەنجامێکی حەتمیو پێویستی زۆرانبازییەکەیە کە هەڵبژاردنی سروشتی لە دەفرە سروشتیو واقیعە بایۆلۆجییەکەدا دەیسەپێنێ .

**کەوابوو گیانەوەرە بەهێزەکان لەهەموو قۆناغەکانی پەرەسەندندا بەهۆی خاسیەتە چاکەکانیانەوە، سروشت بۆ پەرەسەندنی زێترو چێتر هەڵیان دەبژێرێ . بۆ نموونە : ئەگەر تەرزە نەخۆشییەك، بێئاوی‌یەك، قاتو قڕییەك پەیدابێ، بەپێی یاسای سروشت تەنها کۆمەڵە گیانەوەرە بەهێزەکان (بەرگەگرەکان) لەو لێقەومانەدا دەربازیان دەبێ، بێهێزەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ بوودەڵەتر دەبنو لە ئاکامدا دەبنە خۆراکی بەهێزەکان .**

هەڵبژاردنی سروشتی هەمیشە ڕۆنانو ئەرکەکانی زیندەوەر چێتر دەکاتو پەرەپێدانی توانای لە بواری خۆگونجاندن لەگەڵ دەوروبەردا زۆرتر دەکات .. بۆ نموونە : ئەگەر ڕەوەئەسپێك بهێنینەوە، ئەم ڕەوەئەسپە لە کاتێکدا کۆمەڵە گورگێك، کۆمەڵە دڕندەیەك هێرشیان بۆ دەهاوردنو پەلاماریان دەدان، ئەسپە سستو بوودەڵەکان لەبەر ئەوەی کە بێهێزو لاواز بوون .. گورگەکان دەیانگەیشتنێو تێکیان دەشکاندن .. بەمەش ئەو چەشنە ئەسپە بێهێزو بوودەڵانە قڕیان تێدەکەوت بەبێ ئەوەی وەچەیەکی دیکەی وەکوو خۆیان بوودەڵەو سست بخەنەوە کەچی ئەسپە بەغارو بەهێزەکان نەیاندەهێشت دڕندەکان زەفەریان پێ ببەنو لەدەستیان غاریان دەدا، بەمەش دەمانەوەو پەرەیان دەسەندو زۆر دەبوونو وەچەی بەغارو بەتوانای وەکوو خۆشیان لەدوای خۆیان دەخستەوە .

بنەمای دیمانەیی (هەڵبژاردنی سروشتی) لەیەکێك لە ڕوونکردنەوەکانیدا ئەوەمان بۆ ئێلکدەداتەوە، کە چۆن جوداوازکەوتنەوەی تاکێك لەنێو چەشنەکەیدا دەبێتە هۆی جوادوازکەوتنەوەی چەشنێك (هەموو چەشنەکە) بەتەواوەتی، چونکە ئەو تاکانەی کە بەخۆگونجاندن لەگەڵ دەورو بەرەکە هەڵدەبوێردرێن، توخمی پەرەسەندن لە خۆیاندا هەڵدەگرنو پێشکەوتنو پەرەسەندنی هەموو چەشنەکەیان وەئەنجام دەگەیەنن . بۆ نموونە ئەگەر بەرەچەڵەکی ئەو فیلانەدا بچینەوە کە لەسەردەمی پلایۆسین ـ Palecoone لە ئەمەریکای باکووردا دەژیان، ئەم فیلانە جۆری گەورەو جۆری چکۆلەیان هەبوون، یا هەندێکیان خاوەن تیسکو تووکی زۆر بوونو ئەوانیدیکەش بێ تووکو پێست تەنك بوون .. ئەمانە هەرکە سەردەمی بەفرو سەهۆڵبەندانەکانیان بەسەرداهات، هەندێکیان (ئەوانی خاوەن تیسکو بەهێزەکان) توانیان ژینی خۆیان بپارێزنو بە درێژایی سەردەمە سەختەکەی سەهۆڵبەندان خۆبگونجێننو بگوزەرێن، تا لەئاکامی ئەم پرۆسیسە بەردەوامو مێژووییەدا (ماموت)یان لێکەوتەوە . یان ئەگەر ئەسپ بەنموونە بهێنینەوە کە ڕەچەڵەکەکانیان لەسەردەمی ئیۆسین ـ Eocene دا دەژیان ، ئەم ڕەچەڵەکە کۆنانەیان گیانەوەری سستو گچکەڵە بوون، بەڵام لەگەڵ ڕابووردنی سەردەمو ساڵەکان، چەشنێك یان چێتر بڵێین چەند تاکێکیان خاسیەتو ئەندامەکانیان پەرەیسەندو گۆڕان، تا گەشتنە پلەو ڕادەی پەرەسەندنی ئێستایان .

بەم شێوەیە هەڵبژاردنی سروشتی بەواتای هەڵبژاردنی گیانەوەرە ـ چەشنە باشەکان دێت، یان هەڵبژاردنی ئەوانەی کە بەهێزنو دەسەڵاتیان پتر بەسەر ژینگەو سروشتدا دەشکێ . چونکە بێهێزەکان لەبێتواناییو هەڵنەکردنی خۆیاندا بەرامبەر بەژینگە سەختو گۆڕانە کتوپڕە تۆبۆگرافیو ئاو وهەواییەکان تێدەچن، هەروەها سەبارەت بەنەبوونی هێزو دەسەڵاتیان بەسەر زیندەوەرانیدیکەدا جدەویان لێ دەبڕێو دەبنە خۆراکی هیدیکە . لێرەدا تەنها بەهێزەکان ـ چاکەکان ـ ، یان ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەر

سروشتو ژینگەو زیندەوەراندا دەشکێ، تەنها ئەوانەن کە لە دیماهیدا دەمێننـــەوەو ڕێگەی گەشەســـەندنو پەرەسەندنی خۆیان دەگرن : پەرەسەندنێك کە هێشتا ناکۆکیو زۆرانبازیی تێدا نەبڕاوەتەوەو ئەمەش دووبارە لەئاکامی بوونی جـوداییو ناکۆکیو زۆرانبازییەکەدا، دەفری گۆڕانو پەرەسەندنی نوێ بۆ گیانەوەرەکان دەرەخسێنێ .

بەمانـــەدا دەردەکەوێ (وەك داروین بـاسی لێدەکا) کە هەڵبژاردنی سروشتی ڕۆڵو کاریگـەرێتیکی بەکەڵکی لەژینی گیانـــەوەرانـدا نوواندووە .. ئـەوەی ڕاستیش بێت ئـەم هەڵبژاردنی سـروشتییە ڕۆڵێکی مێژوویيو گرینگی لە بواری پەرەسـەندنو پەیاکردنی گیانەوەرە باڵاکانی وەك سـەرەکیەکانو مرۆڤدا گێڕاوە.چونکە ئەگەر بهاتایە ئەم هەڵبژاردنە سروشتییە نەبووایە گیانەوەر نەدەگەشتە ئەو پلەی پەرەسەندنەی کـــە [ سەرەکییەکان ـ مەیموونەکان ] گەیشـــتنێو لەپاشاناش مرۆڤ قەت پەیدا نەدەبوو .

بەڕای داروین [ وەك پاشـــــان ـ ئینگلز ـ یش روونی کردەوە ] مرۆڤ خۆشی هەر لە تخووبی ئەو دەفرە سروشتیو گیانەوەرییەوە . هەر لەژێر دەسەڵاتی ئەم یاسا بایۆلۆجییانەوە پەیدابووە . بەڵام مرۆڤ بەهۆی کاری کۆمەڵایەتیو ، تایبەتێتی وەرگرتنی مێشکیو توانای قسەکردنیو هەروەهـــا چەند خاســـــیەتێکی بایۆلۆجیو کۆمەڵایەتیدیکە ، توانی لـــە گیانەوەرێتییەوە بگۆڕێو بێتەسەرباری مرۆڤایەتی(٨) .

**شایانیباسە کە دیمانەی پەرەسەندن تا ئێستەش زانستە جۆر بەجۆرەکان هەر یەکەی لەشوێنی خۆیەوە زۆر بەڕژدیو گەرمو گوڕی لە ئامێزی دەگرێو ڕۆژ بـــە ڕۆژ پتر بەڵگەی بەڕاست نیشاندانەکانی دەدۆزنەوەو پتر تیشکی ڕۆشـــــن کردنەوەو شیکردنەوەی دەهاوێژنەسەر . لەو زانستانەی کە راستیو زانستێتیی دیمانەکە روون دەکەنەوەو دەبنە بەڵگەی. ئەمانەن :**

١ ـ زانستیی چینەکانی زەمین ـ جیۆلۆجیا (تۆماری سەردەمە جیۆلۆجییەکان ) .

٢ ـ زانستیی توێکاری ـ علم التشريح .

٣ ـ کۆربەلەزانی ـ علم الاجنة .

٤ ـ بەبەردبووزانی ـ علم المتحجرات .

٥ ـ مرۆناسی ـ ئەنتروپۆلۆجیا .

٦ ـ زانستیی پاشماوەکانی لەشی گیانەوەران .

٧ ـ زانستیی دابەشبوونی جوگرافیی گیانەوەران .

٨ ـ زانستیی خوێنو بەراوردکردنی چۆنێتی خوێنی گیانەوەران ..

*** ســـــەردەمی ئەم پەلاخانەییانە دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی کامبری ، ٤٦٠٠ ملیۆن ساڵ پێش ئێستە .**

**** تیۆری بازدان : دیمانەیەکی بەناوودەنگە لەبـــارەی « پاشماك »و جۆرلێ ـ کەوتنەوەی ژینەوەران .زانای ڕووەکناسی هۆلەنـــدی ( هوگۆ ، دی ، فـــریز ) ( ١٨٤٨ ـ ١٩٣٥ ) لەدووای لێرامـــــانو هووردی کردنێکی زۆر لەسەر چـەند چەشنەگوڵێکی نــــامۆ دایڕشتووە .**

***** مالتوس ( ١٧٦٦ ـ ١٨٣٦ ) ، دانـاو ئابووری ناسێکی ئینگلیزبووە . داروین وەك چۆن خۆی دەڵێ، کەلکێکی زۆری لەلێکۆڵینەوە ئابوورییەکانی ئەم دانایـــە وەرگرتووە ، بەتایبەتی لە کتێبی : « گوتارێك لەبارەی ژمارەی دانیشتوان » .**



**سەرچاوەکان :**


**١ ـ الانسان والارتقاء ، جون لويس ، ت : عدنان جاموس ، ص ١٩ .**

**٢ ـ نظرية التطور بين العلم والدين ، د. علي احمدالشحات، الناشر : مؤسسة الخانجي بالقاهرة .**

**٣ ـ اساسيات علم الوراثة ، د. عبدالعظيم طنطاوي و د. علي حامد ، دار المعارف ـ مصر ، ١٩٦٣ ، ص ٢ .**

**٤ ـ نظرية التطور بين العلم والدين ، د. علي احمد الشحات ، ص ٤٣ .**

**٥ ـ اصل الانواع ، داروين، ت : اسماعيل مظهر ، ص ٣٢٧، ( نموونەی شێرەکان ) .**

**٦ ـ الانسان والارتقاء ، جون لويس ، ت : عدنان جاموس ، ص ٨٨ .**

**٧ ـ مقدمة في الانتروبولوجيا العامة ، الجزء الاول ، رالف . ل. بيلز ، ت : محمد الجوهري ، ١٩٧٦ ، ص ٤٥ .**

**٨ ـ بۆ شارەزایی زێتر بڕوانە کتێبی [ دور العمل في تحول القرد الى الانسان ، انجلز ، دار التقدم ـ موسكو ] .**

**٩ ـ نظرية التطور واصل الانسان ، سلامه موسى .**

**١٠ـ الانسان والداروينية ، محمد صالح كريم خان عقراوي ، مطبعة الجمهورية ـ موصل .**

# ا،من«جگەر»ی مامە عەبەم

نوسینی :ج . د . راتکلیف

وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە : ماهر وسمان قادر

**تێبینی**

**١ ـ ئەمەی دەیخوێننەوە بەشی یەکەمە لە زنجیرە وتارێك کە بە شێوەیەکی تایبەتی باس لە ئەندامەکانی لەش دەکاو ئێمەش بۆ لەمەودوا هەر جارەو بەشێکی لێ بلاودەکەینەوە .**

**٢ ـ ناوەکە لە دەقە ئینگلیزیەکەدا (جۆن)ەو برای وەرگێڕ وەهای بە پەسند زانیوە ناوی مامە عەبەی لە جێ دابنێ .**

**« کاروان »**

**مامە عەبە هەر دەم ناگاداری ددانەکانو پرچو سیەکانو دلو گەدەی خۆیەتی . هەردەم ئاواتە خوازە هیچیان لێ نەقەومێو تووشی نەخۆشی نەبن . خۆ منی هەر لەبیر نیەو ئەگەر جار جارە بیری کەومەوە هیچ ناترسێ شتێکم بەسەر بێ هەروەك من هیچ گرنگ نەبم لەلای ئەو .**

من گەورەترین ئەندامی لەشی مامە عەبەمو کێشم نزیکەی کیلۆیەكو چارەکێکە . لای راستەی سەرووی سنگی مامە عەبە شوێنی منەو ئێسقانەکانی سنگی پارێزگاریم دەکەن . لە راستیدا گرنگترین ئەندامی لەشی مامە عەبەم . نزیکەی ٥٠٠ کارم زیاتر هەیە لە لەشدا . ئەگەر لەیەك لەوکارانە دواکەومو توانای بەجێ هێنانیم نەمێنێ ئەوا واچاکە مامە عەبە فاتیحەیەك بۆ رۆحی خۆی بخوێنێو دۆستەکانی تێ بگەیێنێ گورێکی بۆ هەلکەنن . خۆ منم کە ماسولکەکانی بۆ بەهێز دەکەمو گۆشتی بۆ هەرس دەکەمو ئەو ڤیتامینەی بۆ دروست دەکەم کە یاریدەی دەدات بەشەو چاوی ببینێ .



پێویستە لەسەر کۆمپانیایەکی کیمیاوی کە کارگەیەکی گەورە دروست بکا تا بتوانێ ئاسانترین کارەکانی من بەڕێوە ببات. خۆ ئیشە گەورەکانم بەهیچ کارگەیەك بەڕێوە نابردرێن . زیاتر لە هەزار ئەنزیمی جۆراو جۆر دروست دەکەم بۆ بەجێ هێنانی گۆڕانە کیمیاوی یەکانی خۆم . ئەگەر مامە عەبە بە ئاستەم دەستی خۆی ببرێ ئەوا خوێنی ناوەستێ تا دەمرێ ئەگەر من یاریدەی نەدەم . ئەگەر من ترشە ئەمینیەکانی لە دوانزە گرێی ئەوا دروست دەبن نەگۆرم بۆ پرۆتین، ئەوا دیسان مامە عەبە بەرەو مردن دەڕاو . هەر منیشم کە ئەو شتە زیادانەی کە لەش پێویستی پێ نیە دەگۆڕم بۆ یۆریاو دەینێرم بۆ گورچیلەکانی . ئەگەر نیکۆتینو کافایینو کحولو دەرمانی هەمە جۆر بچنە ناو دلو ، دیسان مامە عەبە دەمرێ. بەلام کە دێنە ناو من ئەوا ماددە ژەهراوی یەکان دەگۆڕم بۆ دایۆکسیدی کاربۆنو ئاو .

**کە مامە عەبە زۆر ماندوو دەبێ ماسوولکەکانی گلۆکۆز دەسووتێنێو ترشەکی کوشندە فرێ دەدەنە دەرەوە . بەلام من ئەو ترشە دەگۆڕم بۆ گلایکوجینو هەلی دەگرم بۆ کاتی پێویستی . هەروەها ئەگەر گلۆکۆز زۆر کۆبێتەوە لەناو خوێندا دەیگۆڕم بۆ گلایکوجین بۆ کاتی پێویستی .**

دە ملیۆن لە خرۆکە سوورەکانی خوێن دەمرن لەهەر چرکەیەکدا، ئەگەر من سەر لەنوێ خرۆکە سووری خوێن دروست نەکەم مامە عەبە چی دەکا؟ ئەی ئەگەر زەرداو دروست نەکەمو کاتی نان خواردن بەرەللای نەکەم بۆ چەورایی وورد کردن مامە عەبە دەلێ چی؟

هەندێ جار نەخۆشی وام لێ دەکا لەسەدا (٨٥)ی خانە ئیش کەرەکانم بمرنو هێشتا لەکار ناکەوم . لە راستیدا ئەوە رەوشتێکی زۆر چاکی من نیە چونکە مامە عەبە هەست بە نەخۆشیم ناکا تاکو نیوە مردوو نەبم . خۆ ئەگەر پزیشکەکان لەسەدا هەشتام ببرن هێشتا لەکار ناکەومو لەماوەی چەند مانگێکدا وەك جارانم لێ دێتەوەو گەورە دەبمەوە .

# لەگەڵ دیداری دووەمی چیرۆکی کوردیدا

○ بەشی سێیەم ○

## سێ چیرۆک و سێ سەرنج

ئەکرەم قەرەداخی

### چیرۆکەکان:

### ١.. تابلۆی دێرەوگەیەکی کاروان ..

محمد صالح سعید

« دێرین لەدوای ماندویێتی گەشتێکی دوورودرێژ، شانی حەوانەوەی خستە سەر سەکۆی شانۆیەکی ئەم ژیانە .. چاوی یادگارەکانی بەهێمنی لێکناو ، گوێی بۆ دەنگدانەوەی سەرشانۆ ڕادەگرت ..»

ـ لەگەڕان بوویتەوە ..؟!
ـ شەکەتم ، مێملی تروسکەی هیوایەکم..
ـ هەربۆخۆت ...دیسان لە خۆتدا توایتەوە.. سووڕایتەوە.. ڕاوەستایتو گیرایتەوە.. گەڕایتەوە .. ؟

ـ سەقەتم ..گینگلی ختووکەی نزایەکم..
ـ هێندە بەخۆتدا مەچۆرەوە.. تۆ منەی کێ دەکەیت.. چاوەڕوانی چی دەکەیت..؟

**دەنگەکان:** هەمیشە هەر لە زیندەخەودایە(١).. لەگەڵ ئەو هەموو چاولێسوورکردنەوەو ڕەشییەی نیشانیدراوە.. ئەمە لە چ قوڕێك دروستکراوە... من نادێرمە ئامێزی.. وادیارە دڵی گەورەی ماتەی کارەساتێکی ناوێزەیە.. ناپسێت .. نانەوێت...

ـ دیسان دەستی بە وڕاوەکردەوە(٢)...

**دەنگ:** ئەم دوانە دوو دەموچاوی بەرامبەربەیەکوەستاوو .. دوو بیری دژبەیەکو پشتلەیەکن ..

ـمن وورێنە ناکەم ..، تۆش هێندە بیری پووچەڵ مەکەرەوە .. چونکە ئەنجامەکەی ناهەمواریی و پەژارە بۆ خاوەنەکەی بەجێدەهێڵێت...

**دەنگ:** سەیریکە ؛ ناوچەوانی گرژبوو.. ڕوویەکی ترشوتالی وەك ڕمـوزن.. تالاوی بیرکردنەوە ڕەشـەکەی ـەمراوی دەهێنایەوە ..

**چۆك(٢):** من دەترسم..لە سێبەری خۆم سلدەکەمەوە.. ئەو وەکو سیرمە وایە..

**دەنگ :** مرۆڤی خاوەن بڕوای چـاوڕۆشن کامەرانیی لە حەبتداو پەژارە لە بەزیندا دەماشێتەوە..

**چۆك :** ئەمـانەی تۆ هەڵیـدەڕێژیت وەکو بنێشـت جووراونەتەوە..

**زیت:** پیشەی تۆش هەمیشـە هـەر ماسـاوە.. هەر دەیکەیتو خوراوەتەوە...

**دەنگ:** دیسان چـاوی بیرکردنـەوە زەقکرایـەوە .. داخرایەوە..

پەلکرایەوە.. داچەقایەوە..

**چۆك:** ئـەوا جـارێکی تریش کزەبـای سـارد بۆمـن هەڵیکردەوە.. با کزۆلە هەڵبتروشکێم.. ناخیشم خۆزگە بەو لاوە قیتەلانە دەخوازێت کە سنگیان لێ کردۆتەوەو شەڕ بـە کرێوەو تۆفـو ڕەشەبا دەفرۆشن.. بێگومان ئەمانـە هاوەڵی ئەو کیژانەن تزی پەخشیان سەروسنگی بەرزو قەشەنگیـان بەجێهێشتووەو بەگژ ئاسمـاندادەچن ...، مووچڕکە بـە پشتمدا دێت .. با خۆم گرمۆلە بکەمەوە .. سـەرکزبگرم ..

**زیت:(٤)** من شەیدای قاسپـەی کەوی نزارو کۆسـارو تەدپاڵو لوتکە هەزاربەهەزارەکانی ولاتەکەمم.، لەگەڵئەوەشدا

هەندێك جـار قینم لە کەوە ..، بەتایـەتی لـەو کاتانەدا کە دەبێتە کەوی بنەی ڕاوکەران .. هەروەها لە ڕۆژانی بەفرو بەستەلەکدا کە چیاکانی کوردستان بەفر دایاندەپۆشێتو ، ڕەشێنە بە دەرەوە نامێنێت .. چیـاکان بەجێدەهێڵن ... دێنە پێدەشتەکانو بۆ ڕەشـایی دەگـەڕێن... چـونکە لەو کاتانەدا بە کلاو دەگیرێن ...




بۆ جـارێکی تر دێرین کەوتـەوە ناو گێژاوی نوشتەی یادەکانەوە.. بۆ بەرەو سەرچـاوەی کانیاوە ڕوونەکانی نێو چیاو هەردەکان ڕەوتیدەکرد ..، گەشـتی نزاریدەکرد .. هێشتـا تێری نەخـواردبوو... نـاسۆری دەنگـەکان ڕایانچڵەکانەوە...

**دەنگ :** چیاکان بەجێهێلران.. چاخانەکان سیخناخن..

**چۆك:** واچاکە لە کونجی چاخانەیەکدا خۆم مەڵاسبدەم.. بەرئاگردان بۆ خەفەکردن چاکە ..

**زیت:** سەکۆی چاخانە شوێنی پیرو پەککەوتەو بێکارەو ماندووەکانە... مەگەر بە ڕاگوزارهی تری لێ دابنیشێت.. یان بۆ منەو چاوەڕوانیی ...

**چۆك:** چاخانەیەکی حەوێنەرە... بەلام لە بێتولەتی مندا وەك سنگ لەبەر دەممدا چەقیوە .. دیوی ناوەوەی منو دیوی دەرەوەی ئـەو وەك چـەرخ لـەکاردانو ، یـەکتـری دەمەزەردەکەنەوە ...

« دێرین چاوێکی کـردبوو بـە هەزار چاو ... بـەلام هەناسەی لەبەرخۆی بڕیبوو..، لەمکاتەدا پەلەپەلکەرێك بە هەڵەشەیی خۆی بە ژووردا کرد..»

**چۆك:** ئەمە کێیە... تۆبڵێیت لە ئاوەڵە کەللەشەقەکانی خۆی بێت ..؟!..

**دەنگ:** سەیری نەگونجان بکەن .. ڕانکوچۆخەڵی مەرەزی ئاوریشمین... پەستـەکێکی دەڵب.. لاوەنـدیـەکی چڵکنی شلـوشێـواو... پشتێنێکـی زەق.. دەمـوچـاوێـکی باریکودرێژ... ملفیچکێکی وەك ڕەگەبامێ... دوو سمێڵی فش.. جامانەیەکی لەرزانە... کەمێك بە لارەوە دایناوە.. وادیارە شتێکی لە بنهەنگلدایـە... بـەلام کالەی لاستیكو پووزەوانەیان نەووتووە..

**زیت:** لەوەدەچێت جۆری بیرکردنەوەکەشی وەك خۆڕازاندنەوەکەی زۆنگاوبێت ...

بماشێتەوە ..

ـ لەوانەیە نەیوێرابێت لەوە پتری پێوەبڕوات .. ترساوە نەوەکو بیهەژێنێتو ، داوایەکی ترسناکی لێبکات .. دوای سوختەو دەروێشی .. پاشلیشی پیسبکات .. ئەمە تەنها بیری من نییە .. بیری هەموو ئەو کەسانەیە بەم شانۆگەرییە تاسدەیانباتەوە ..

**چۆك** : گوناه مەکەن ..

**زیت** : مەبەستت ئەوەیە بە ئاشکرا کڵاوی بۆ بدروون ئەمجا ..؟؟ خواتبێت ..!

**دەنگەکان** : سەری لێیدەخورێت .. مریشك خۆی خۆڵنەکات بەسەری خۆیدا کەس نایکات بە سەریدا ..

**زیت** : دەستەمۆیە .. دەستەمۆ ..

« تەواوە نواندنی شانۆو وایدەسەلماند .. جلفڕ لە خاکو پادا وەستابوو ، چاوەڕوانی فەرمانیدەکرد .. کابراش بە لووتبەرزییەکەوە جارجار سەیرێکی سووکی دەکردو ، چێژی ژانی ژێر زبانی ماچی ئەمی نەدەویست ئەوەتا بەگوێی خۆتان ببیستن جلفڕ چیدەڵێت ..

ـ فەرموو دانیشە سەرسەر .. جگەرە .. ڕۆسمانە ڕۆسمان .. ساردیبێنە .. چابێنە .. ماستاویش ..، نابێت هەرساردییەكو چایەك .. ماستاو .. ماستاو ..

زیت لەوێوە هەڵیدایە : « خەستەو خوڕەینایەت ..، خەستەو خوڕەی نایەت ..

« جلفڕ سەری قاڵە .. چەند ئلووڕێكو سەیرانێك ... زبانی تێکەڵوپێکەڵ .. »

**جلفڕ** بەپەستییەوە وتی : ئەوە کێیە .. ئەی ئەمانە ... سەیر سەیرن..نایەڵن هەناسەیەکی بەئاسوودە هەڵبکێشین.. هەر هێندە دەزانیت پەلیداخێکمان پێدا دەپلۆسن ..

« فەررموو جگەرەیەکی تریش .. ماستاوێكو گۆشتی برژاو .. »

چاوتانلێبوو .. دەسەیری شانۆی پساوبکەن .. هەرقومێكو .. نۆش ..، هەر پاروویەكو .. بەبەزو پاڵانچەی ناوشانتبێت .. جگەرەیەکیتر .. دووان .. سیان..چوار.

**دەنگەکان** : ئەی ئەو .. ئەی ئەو ..

ـ هەرهیچ .. هەر هیچ ..
ـ ئەم بۆ وایە .. ئەو بۆ وایە ..؟!



«لەم کاتەدا چۆك بەلاتریسکەی چاو سەیری ملۆزمەکەی خۆی دەکرد..»

ـ ماتەیخۆیداوە ، بەڵام زەردەخەنەکەی گاڵتەپێکەرە..
**زیت** : چرپنە .. جلفڕە(٥) .. لێینەهاتووە ..
**چۆك** : تۆسەیری .. ئەڵێی خەنجەری دەبانە .. ، خۆی لە کالاندا ناگرێت ..، هەر هەڵیدایە ..، کەواتە لەخۆیاننییە ..

«کابرای سمێڵ فشی جرپن بە پەلە جگەرەیەکی دەرهێنا.. خەریکبوو چەرخەکەی لێبدا .. بەڵام وەك کێچ ڕاپەڕی».
**دەنگ** : ئەوەچیبوو .. بۆ وا شلەژا ..

**زیت** : ئەی لەو وەستانی پاڕانەوەیە .. ئەوا جلخوارێکی لەبەردەمی خۆیدا چەقاند ..

« دیمەنێکی شانۆییە .. بەزۆر ماچێك .. ئەملا ماچ .. ئەولا ماچ .. » .

**زیت** : ئەی ئەو ..

ـ هەر هیچ .. هەر هیچ ..
**زیت** : دەزانیت بۆ ، ئەم کخەیە .. ئەو بڤەیە .. ئەم جلفڕە .. ئەو جلدڕە ..

« دیمەن هەر باسەفایە .. کخەی بزنە جینگانە(٦) هێشتا هەر وازناهێنێت .. ماچێکی تریش .. کوڕنووش .. »

« جلفڕ ئەوناوەی وڕوژاند .. کابرای خستە سەر هەردوو چاو ..

داواشی هەر بەسەرچاو .. جەرگی بوێت یان هەناو .. چاوەڕوانە بۆ فەرمانی .. دەیخاتە سەر گلێنەکەی دلواکانی .. »

**دەنگەکان** : چاوەکانو زارەکان ئەبڵەقبوونو لاڵبوون ..

ـ ئەڵێی هەزار ساڵە نەیدیوە .. برای باوکیتی ..
ـ نانا کەسی دایکیتی ..

ـ هێندەی نەمابوو بە تلو ناودەمی ترشی زەردیشی

**زیت :** ئەم نۆکەرەو .. ئەو ئاغایە ..

ئیتر وایە ..، بەشەو ، بەڕۆژ ، لەبۆ کابرای سەروسایە ... بەردەستێکی بەوەفایە ..

ــ ئەمیان وای بۆ ماوەتەوەو .. ئەویشیان وای بۆ لواوە.
ــ جا ئەمە لەم چاخانەیەدا بەم جۆرەیە .. ئەی لەماڵەوە .. لەوانەیە بەرەکەی خۆشی بۆ دەربکێشێت ..

ــ من واناڵێم .. خۆی خاوەنماڵە .. لەوانەیە کلیلی دەرگای دەرەوەو ناوەوەشی لەکنبێت ..

**زیت :** ناچارە .. ئەم خودیخۆی ئەوی کردووە بە خاوەنی خۆی ..

**دەنگ :** بەڵێ وایە .. ئەنجامی کاری گەمژەڵێك .. یان پووچەڵێکی وەك ئەمە کلووبایە ..

**زیت :** ئێوە هێشتا باش بۆی‌نەچوون .. لەلای کابرا ئەم وەکو گیسکەکەی هەیاسی خاس وەهایە ..

لەسەر یاساو بڕیاری « بۆز بە لەڕی » هەر تۆزێك بەخۆیدابێتەوە ، دەبێت هەڵوێستێکی ناهەمواری تەزاندنی بۆ دروستبکرێت ، تاکو بە گروێیی بهێڵرێتەوە ..

ــ مەبەستت ئەوەیە پەنجەی نەبێت سەری خۆی پێ بخورێنێت ..

**زیت :** هەربژیت .. بەملیاکەوتیت ..
« سەر شانۆ هەموو ئاوازی لاقرتێو گەپ دەڵێنەوە ..

ــ « بۆز بە لەڕی ..!! » « بۆز بە لەڕی .. !! »
**جلفر :** گەورەم ، سەیری‌چی‌دەکەیت ..، ئەم چەرخە؟! چاکەکانە .. فەرموو با لاتبێت .. بۆ خۆت ، تۆ نەزەرتلێ‌کردووە .. زوڵاڵی‌خۆتە .. تازە هەڵی‌ناگرمەوە ..، بەسەری تۆ .. ئەم شخارتەیەی تۆش بۆ من .. ئەمە لەهی لای خۆمان ناچێت .. بەرگەکەی جوانە .. بۆ یادگار هەڵی‌دەگرم ..

**زیت :** ناوێرێت بە سەری خۆی سوێندبخوات .. شخارتەکەشی وەك شاڵی نزرگەی باپیرەگەورەی ئاغاکەی بۆ

موو فەرك دەیباتەوە ..

**دەنگ :** ئێستە هی وەکو ئەمە خراپتریشی لێ بەسەرهاتووە .. هەر کە سەیری دەوروپشتەکەی خۆی دەکات .. وەك کیسەڵێکی گەڕی لەئاوبڕاوی سەرلێ‌شێواو .. بە ترس‌و شەرم‌و تەریقییەوە سەری بۆ ناو قاووغەکەی



پەترۆدەبێت ..

**زیت:** ئەی بۆ ناڵێیت هەرساتێکی مردنێکە..

**دەنگ:** جاران دەرگاکانمان کلیل‌و کوڵۆم‌بوون.. دەستی شارەزای خۆمانە نەبوایە نەیدەکردەوە..

**زیت :** ئێستە کلیل‌و کولۆم شکێنراوە .. هەندێکیشیان لە گرێژەنە براوون ..

**جلفر:** لەگەڵ ئێمەمانانێتی..
**چۆك:** جاکێ لە گرێژەنەی بردووە..؟!
**تۆ** ئەو .. ئەوان .. هەندێك لە خۆمان ..

«نازانم چۆنبوو خولخولۆکەی بیرەکانی دێرین چوونەوە بۆ وێنەکانی بەڕوو قارچك‌و نیسك‌و هەڵماتی مووشێنی منداڵان‌و نەختینەکانی ناو کولۆرە دارەکان ..، ئەوەبوو دیسان دنگەکان هێنایانەوە :ــ

ــ جاران بەڕوویەك دەخرایە ژێر ژیلەمۆی ناو بیرەئاگردانی شەوانی بەستەڵەکی زستانی سەختەوە ..، ملوەیەك چاوەڕوانیی دەکرا تا هەڵدەتۆقی..

**دەنگ:** ئێستە هەیە بە هەورەتریشقەیەك وەك قارچك هەڵدەتۆقێت..

**زیت:ــ** بەڵام ئەوانە قارچکەمارانەن..
**دەنگەکان:** هەر ووتراویشە نیسك بەروپشتی بۆنی‌یە..

ــهەڵماتیش بار .

ــهەر بار.. هەندێك‌جار دەکەوێتە بەر پیتکەی مووشێنکەران‌و تیلی‌پێ‌دەکرێت...

ــ هەندێك هەڵمات (زیزانە)یە(٧)..

ــهەڵماتی چواریش هەیە.. لەپاش یاری «یەکەوگۆتەکە» هەڵگرتەیی پێ لێدەدرێت..، هەرچەندە هەڵماتیشە، لەوانەیە کەشکەئەژنۆی بەچۆکاهاتووەکانی سەرەڕێگەی خۆی بشکێنێت...

**چۆك:** ڕاستە ڕاستە... ئای کە هەڵگرتەییم خواردووە..
**زیت:** هەر لەیەك لاوە نایخۆیت.. لەکوێتە.. لەملایشەوە

هێندە کەشك(٨) دەخۆیت تا هەپرووندەبیت..



چاوەکانی دێرینی باپیرەگەورەمـان خوێنی تێـزابوو .. خۆشی سرەوتی لەبەربڕابوو ... هەناسەی ساردی بۆ تەمەنە نەبەکامەکان هەڵدەکێشاو ، پلوسکی فرمێسکەکان ووشکایی تێ گەڕابوو..، بەڵام باشبوو دڵی خۆی بەوە دەدایەوە کـە چلفرو ملفیچکو ئـەوانی تر(١٠) تێگەیشتبوون چی‌یـان پێ دەووتراو چۆن سەیردەکران... ، لە بۆنەو هەڵوێستەکاندا لەلووتیاندرابوو... شکێنرابوون... چییان پێ نەدەکرا..؟! لەسەرێکەوە مراوی‌بوونو تەڕنـەدەبوون .. لەســــەرێکی تریشـــەو چـاوبەرەوژێـری دادو ڕاستیی‌و، چـەڵـەمـەی بەیەکادانی دیوی ناوەوەی دەروونی خۆیان‌بوون...

لەخۆپیشاندانە خۆبانەکانیـاندا، لەجیـاتی ئـەوەی سەربەرزبکەنەوەو سنگ‌دەربپەڕێنن...

لـەبریتی ئەوەی دروشمـی (پیـرۆز) بچـڕن.. تەنهـا لێوەلەرێیان‌بـوو... ئەوانەی دەنگیشیـان لێ دەهـات... دەنگێکی نووساوو لەرزۆك‌بوو...، دیدەیان چیاکانی نەدەدی.. درەختـە سـەوزە بـەرزەکانیـان نەدەهـاتەبەرچـاو..، تەماشاکەرانیان بـە دێوو درنج دەبینی..، کوڕبەو منـداڵە دڵپاکە دەستپاکەکان ، کە سروودی پاشەڕۆژیان بۆ خۆیـان دەچڕی. لەلای ئەمان بستەباڵای گاڵتـەبازاڕ بوون..، لاوە بزیوەکان.. ئەوە هەرهیچ.. ترسێنەرن..

ــ چونیت.. دیارنیت...

**چۆك:** «جۆری ووتنی ئەم چۆنیەم بەدڵ نییە..مەبەستی تەشـەرە..»(١١) ئـەی‌خـۆی... چیـت.. چۆنیـت.. بۆ وادەدوێیت ...

ــ ئـەوە بییر لـە چـی دەکـەیتـەوە.. بـۆ وەڵامـی خۆش‌و چۆنیم وا دەدەیتەوە ..

**چۆك:** ئەی تۆ چۆنیت..؟!

ــمن.. چۆنبم.. لەخۆمـدا.. لەنـاو نـاخی خۆمدا خول‌دەخۆم.. نە بەملاداو، نە بەولادا نامئاوێزێتو نابزوێم.. بەم بییرەوە دەتلێمـەوە. چونکە هـەندێك جار دەمـەوێت بەولادا شتێك ببزوێم، بەڵام خۆم‌دەکێشمەوە..، یان هەنگاوێك بەملادا بکەرێمەوە.. زۆر لەخـۆم دەکەمو وازدەهێنـم... چونکە لەم هەڵوێستـەدا گومان هەنگاوەکانم دەمەێنێت...

**زیت:** هێشتا ئەمیان لەویان چاکترە..

**دەنگ:** هەندێك جار ئەوانەی لە درزی پەنجەرەکانیشـەوە سـەیرمان‌دەکەن... مەزەیان هەر لێمان دەجوولێت..

«جیهـاندیـدەیی دێرین خەمـەکانی پێ خستـە سەر گازەرای‌پشتـو، بۆ سبەینێی نەوەکانی چاوێکی کردمەوە بـە هەزار چاو ..، پزووی خـەمو بیدەنگی ڕەواندمەوە ..، بـە دەنگێکی گڕی بەسۆزەوە سەر شانۆی ئاوەدان‌کردمەوە..» :

**دێرین:** دەمێکـە من گوێ بۆ هەمووتان ڕادەگـرم... هەندێك ڕاوێژیش بەمن‌بکەن.. گەلێك ڕاستی هەیە لە ناخی ژیانی مرۆڤایە تیماندا جۆشی‌خواردووە..بە درەنگ لادەچێت، هەرچەندە کـە لووتت بـەر بەردی ئەلحـەدکەوت بە چـاکی دەتچووزێنێتەوەو دەتهێنێتەوە هۆش خۆت ...

ــوەك چی..؟!

**دێرین:** گەلێك شت.. یەکێك لەوانە؛ من لە دێرزەمانەوە بەڕاستی خۆم بە برابچووکی تۆ بزانـم.. کـەچی تـۆ بـە ڕووکەشیش وای‌دەرنەخەیت.. بمکەیتە سوخـرەی خـۆتو بۆ مەبەستت بەکارم‌بهێنیت..، بەردەستیت بکەمو نزم سـەیرم بکەیت ..، سـەربازی پارێزەرت بمو داگیرم‌بکـەیت ... ، ئاودێرت بم‌و ، ووشکایی بخەیتە گیانمەوە..، بە خاکی خۆمەوە وەرزێرت‌بم‌و.. ووشکەمزو هەزاربەکێشم پێ‌نەبڕێت..

بییرو کانیی‌و سـەرچـاوەکانی ژیـانم پڕبکـەیتـەوە...، لەجیاتی ئەوەی کەلاوەکانم بۆ چاك‌بکەیتەوە.. خانووەکانیشم بەسەر نەختینەو زەخیرەو کەلـەپووری هەزاران سـاڵەمدا بڕوخێنیت...

کەی ئەمە خودا بەرداری هەیە..؟!..

**دەنگەکان دەڵێنـەوە :** تۆ لـەگـەڵیـدابوویت.. دوای دروشمەکانی ئەو کەوتیت.. لەم‌کـاتەدا جلفر ڕوودەکاتـە چۆك‌و، دەڵێت:

من لەم پەنگو باڵۆرەیەی ئەمانە سەرم‌دەرناچێت ..

**چۆك:** ئاشکرایە .. بەڵام بە ئێمـە ناکرێت .. ئاگات لە سەروجامانەکەت‌بێت... با نەیبات ...

**دێرین:** ڕاستە؛ ئەوسا من لـەگەڵیدابووم.. بەڵام دوای پیرۆزیی درووده یەزدانییـەکان کەوتبووم.. ئەو شیخ بوو، منیش مرید.. بەڵام دروشمی خۆم جیابوو..

«مـن بۆ یـەزدانم دەکـردو.. ئـەویش بۆ بـەنـدەو بەشخواردن...»

**زیت:** ئەی بۆچی لـە کـەشتێکی وا تووشـدا لە دەوری

کلپەی مووری گولبێنــەی گاتــەکانی نزاو درووی خــۆتان کۆنەبوونەوە..؟!..

**دێرین:** کۆبوونەوەکانمان کرچو بێ فــەرو بێ پیت بوو.. فرۆی مەبەستمانی پێ نەدەمەیی.. پیلانەکانی بەرەی هێرشی بێشێل پەرشی دەکردینەوە..

«نووانــدنی شــانۆ بلاوەبوو.. بلاوەلێ کردنی لەناکاوی بەکۆمەل.. »

**دێرین:**ــ ڕاستە گەلێك جار ئەممان بەخۆمانەوە دیوە.. بەلام هەر ئێمە کاری وامان نەکردووە..

تاشی لاپــەڕەکانــم بکۆلنــەوەو هــەلدەنەوە.. دەبینن چەندجارانێك وەك چۆن جۆ بە دیواردا هەلدەگێڕن، ئــاوا بە چیادا، بۆ لوتکە هەلگێڕاوومو ، لە هەلدێری تووشەوە دەست لە بالم کراوەتــەوەو فڕێدراومەتە ســەرەونگوم..، بێگومان ئەمە لەسەر ئەو پەندەی کە دەلێت: «ئەگەر ئەزبوون بۆ پێدەشتو.. ئەگەر دزبوون بۆ بیابانی نەهاتیی ڕۆژانێکی تری .یانی پرمەلامەت..»

**دەنگەکان :** نەرمووتان دوای پیرۆزیی درووەدە بەزدانییەکان کەوتوویت... ئەی بۆچی نزاتان نەکرد بێت بە هاناتانەوە..؟!.

**دێرین:** تۆش تەشقەلەمان پێ مــەکەو مەمــاندەرە بەر کلکان.. خۆشــت هەمووشتێــك باش دەزانیــتو گالتــەو لاتر تێمان پێ دەکەیت...

**زیت:** دەلێن جارێك لە بارگای بارەگادا ، بە ئامادەبوونی بەیامبەرەکان، رەوی مەردومــان دەستپێ دەکات .. هەموو تیرەکان لە مۆلگەی کاتی مەڕەبێرە ئامادەبووبوون بۆ ئەوەی شیریان بدۆشن...، کە ئێوە بــە پێتــاوی شڕو بــەرگێی کولکنی بلکنەوە هاتبوون ، هەرکەسێکیان پیاراگەییبوە هاتبوو شیری لێ دۆشیبوونو هیچکامێکیان ئێوەیان بەسەرنەکردبۆوەو خێویشتان بۆ نەبوو..

دێرین: ئێوە وادەزانن گەمەی «دامە» دەکەین..، ئەگەر ئەوەشی بێت ، ئەوەتا لە بۆنەیەکدا شاکش کراو شێرپەنجەش لــە بارگەی دۆڕانــدنی دەورانــدا ئەوی تری توورهــەلــداو کلای کرد...

**دەنگ:** بۆ نالێیت نزاکانتــان گەیشتە گیــانی هــەواری کۆنەهەلوێستو ئەویش خوێن گرتیو بوو بە مۆتەکەی نــاخی دەمارەکۆنەکەیو پەترۆی نەبرد..

**دێرین :**دەمخۆش .. ئەلێیت لــە دلی منــدایت ..، جگەلەوە دوا قولپی ڕشانەوەکەشی کالا سپی بە پاکژەکەشی پیسکردو شەرمی کرد وەك ئالایەك جارێکی تر بەرزیبداتەوە..

زیت: ئایا ئەمانە خۆشیی و ئاسوودەیی دەخاتە بارەگای دلو مێشکتانەوە؟!...

**دەنگەکان:** دل بەمانە خۆش نابێت.. بــەلام تروســکــەی ئاهێکی تێدەگەڕێت..

« لەژێر سەبەتەی سەرشانۆدا ، مریشــکە شـــاخدارە چاکەکان هەندێك جار هێلکەکــانیان پیس دەکــەن.. بــەلام لەوانەیە بۆ هەلهێنانێکی تر بنرێنەوە...»

**زیت:** ئەگەر بەشیمانان شاخیان لێ بروایە.. هەندێك لەوانە شاخیان لێ دەڕوا..

**دێرین:** هــەیهوو هەیهوو.. من وەك پیرەداربەڕووم لێ هاتووە.. لەم بێژە توێکلدارانــەم زۆر بیستووەو گــوزمر.. بەلام ئێستەکە سەیری داوێنی خۆم دەکەم... دلم بە چووزو خەلفە نوێکان خۆش دەکەم... دەنگەکان: زیز مەبە.. ئێمە دەوەنی ناو پێشــەلانی دارستانتینو «هەر دەوەنیشە دەبێت بە دار..»

ــ دەست لەدەستەو یەك بینایی .. یەك دەنگو یــەك ڕانومایی ..

ــ بژارێکی چاكو .. بێ سەرەڕۆیی ..

ــ چراووگێکمان بەدەستەوەبێت نووتەك بکاتە مەشخەلان.

ــ هەرزە نەبین .. خەرۆ نەبین ..، پارووش لــە دەم بکەوێتە خوارەوە ، بۆ کۆش باشە ..، بەلام چاکی بجوویت .. ئەگەر خێریش بێت ، خێر بە خوێش .. نەك بە دەرویش ..

ــ دێرینەکان .. جێماوەکان .. هەموو ئەلقە پساوەکان ..گشتی ئاشە ڕووخاوەکان .. بکەینــە کۆی کۆلینەوەی ، دەرمانێکی کاریگەری ئەم زامانە ..

[ خەلکەکە لــە دێرەڕەوگە مۆلیـــاندابەوە .. گوێ هەلخرابەوە .. چاوەچاوو منەو ماتە دەستیپێ کـــردەوە .. « بەلام هوشیاربن ، ئاگاتان لە سەرکێشی بێت .. » ]

[هەمیسان بە هەزاران هەزار دەنگ کەوتەوە ڕێڕەوەکە.. بەدەم ڕەوکردنەوە دەیانچڕی .. ]

ــ بیابچنەوە .. گولبژێربکەن .. بژاربکەن ..

ــ دەوربکەنەوە .. با نارەوانتان نەبێت ..

ــ قوولترو تێرتێر بیربکەنەوە .. تا هیچ نواندێکتان لــە یاد نەچێتەوە ..

ــ زبانی خۆتان تیژ بگەزن.. فێری بکەن چۆن دەگەڕێت. ددانەکان چی دەهارێت .. دەمتان چی دەملچێت ..

ـ وەك مارانگاز سەری پەنجەکانتان داخبکەن .. بزانن چی پێ دەنووسن و دەستی کێ پێ دەگرن ..

ـ ئەندێشەباز مەبن .. شەماڵە مەگرنەوە .. خۆتان بگرنەوە .. دەنگتان و ڕەنگتان و کامەرانیی و سەرفرازیی و ئاسوودەیی و سەنگتان بگرنەوە .. هەموو شتە بەنرخ و پیرۆزەکان بگرنەوە ..

« لەم کاتەدا لەناو کۆمەڵگاکەدا ـ زیت ملی قوتدەکاتەوە. بەگەرمیەوە هاواردەکات » :

ـ تا خۆمان بە زیندوتر بزانین گوڕەی دڵە بەجۆشەکان پتەوتر لێدەدات ..، تا بزاوتنمان خورۆشتربێت .. سیبەکان هەناسەی قووڵتر دەدەن و ، خوێنەکان نامەیێن ..، دەبجمێن تا خۆڵ و دۆتان بەسەردا نەکرێت و ، ڕەنگی مردووتان لێ نەنیشێت ..

« چاوی شانۆ گەشە ..، دێرەڕەوگەی کاروان سیخناخە .. جەنجاڵە .. ساواکان ، پیشەو کاریان گروگاڵە .. ، پیران ، هەندێکیان لەسەر یاسای « پرسابەو دانابە »و ـ ئەوانیتریشیان لەسەر ڕێسای « زانا دانایەو .. دانا توانایە .. » کۆڕی ڕاوێژیان گەرمەو دەبێت سەرفرۆبن ..

لاوەکان تاوی ئەسپی ئارەزووی سەرکەوتنیان لێداوە و ، گۆزنی ئازایانەتر لێدەدەن ..

پێری ژنانی سکپڕ سەرە ڕێگەی ڕەوگەی کاروانیان لێگرتووین چاوەڕوانیی زانێکی نوێ دەکەن .. ناڵەو گاڵەی ژانی نوێیان هەموانی خەریککردووە و ـ تا بێت داخورپانەکانی دژان تەشەنەپێدەکەن ..

دێرینیش هەستاو دەستیدایەوە گالۆکەکەی .. دیسانەوە دوای هەنگاوەکان کەوتەوە .. ـ بەڵام ئەمجارە بریاریداوە ئەستۆی گەڕانەوە بشکێنێت ..

**« لێکدانەوەی هەندێك ووشە »**

**١ ـ زیندەخەو : احلام اليقظة .**
**٢ ـ وڕاوە : وڕێنە .**
**٣ ـ چۆك : ناوە ، لە بەچۆکاهاتن وەرگیراوە .**
**٤ ـ زیت : ناوە ، بە مەبەستی « زیتەڵ » .**
**٥ ـ جلفر : شڕشێت و هەڵەشە .**
**٦ ـ بزنەجینگانە : ئەو بزنە چرپنانەیە کە هەر هەڵدەتیزێنێت**
**٧ ـ زیزانە : هەڵماتی زۆر بچوك .**
**٨ ـ کەشك : بە دوو مەبەست بەکار دەهێنرێت :**

**أ ـ دۆی ووشکراو کە لە دواییدا بۆ دۆکەشك و هەندێك خواردەمەنی بەکاردێت .**

**ب ـ کەشك : پەنجەی باڵابەرزە دەنووشتێنرێنەوە بە پەنجەگەورەو لە پڕ لە تەوقی سەر دەدرێت .**

**٩ ـ ڕەشێنە: لە ڕۆژانی بەفردا کە زۆر دەبارێت بە پارچەیەك لە زەوی بێبەفر دەووترێت .**

**١٠ـ بۆنە : مناسبة .**
**١١ـ تەشەر : طعن .**

---

# ٢.. ئەستێرە بەرزە

**■ سەلاح شوان ■**

**«نیسانی ١٩٧٩»**

ـ بابە ..! کوا ئەستێرەکە ؟!
ـ بەرخەکەم لێرەوە دیار نابێت .
ـ بۆ دیار نابێ بابە ؟!
ـ کوڕم ئاسمان تەڵخەو ..
ـ ئەی ئاسمان بۆ تەڵخە ؟!
ـ ئەمم ... چونکە .. ئەم شارە گەورەیەو ، نەوتی زۆر لێیە ـ کە نەوتەکان ئەسوتێنن ئەبێ بە دوکەڵ و ـ بەری بینینی ئەستێرەکان ئەگرێت ... کە چووینەوە بۆ « کانی پەریان » پێکەوە ئەچینە سەر لوتکەی « پیر سوەیل » و لە وێوە سەر ئەکەوینە سەر ئەستێرەکەت ..

ـ بابە ! ئاخر من ئیتر ناتوانم بڕۆم ... بابە ! مەهێڵە دوختۆرەکە بمبا ... خۆی چاك ئەبێ . خۆی چاك نابێ توخوا ؟!

ـ ڕۆڵە ئاخر دوختۆرەکە لە ئێمە باشتری لێئەزانێ ، ئەبێ بە قسەی بکەین .

ـ مادام لەگەڵت نایەم . ئەستێرەکەشم ناوێ .
ـ خەتای خۆت بوو کوڕم خەتای خۆت بوو ..

ـ بابە ئەی تۆ نەتوت فڕۆکە ئەتوانێ بگاتە لای ئەستێرە

بەرزە ؟! .. ئینجا پێی ئەڵێم ئەگەر چووە لای بەربداتەوە . بابە ! بەیانی ئەمبەیتەوە بۆ ماڵ ؟ خۆ ژان ناکا .. ئەوسای برینداربوم زۆر . ژانی کرد ، ئیستا ژان ناکا . ئەی تۆ نەتوت ئەگەر بگەینە لای « ئەستێرە بەرزە » ئیتر خۆی چاك ئەبێتەوە؟! ئەی بۆ نەچووین بابە ؟! بابە ! بابە ئیستا بمکە باوەشتو بمبە بۆ سەر « پیر سوەیل » ئیتر لەوێوە من خۆم ئەڕۆم .. ئەی تۆ خۆت نەتوت لەوێ بەولاوە بەپێ نارۆین؟! وەك ماسی چۆن لەناو ئاوا مەلە ئەکا ئەوها ئەڕۆین . ئەی نـاخنکێین ؟! بـابە ماسی قاچی نابەشێ ؟! ئەی بۆچی کە « خلە رەش » شوشە باروت ئەخاتە ناو « گۆمە زەردە » وە ماسییەکان ئیتر ناتوانن بڕۆنو لەسەر ئاوەکە لە سەر گازی پشت ـ ئاوەها وەکو من ـ درێژ ئەبن ؟! بـابە ! خۆ بـالیشیان نییە بفڕن و بچنـە لای « ئەستێرە بەرزە ». منیش ئەگەر باڵم هەبوایە ئیستا ئەوها ئەفڕیمو ئەڕۆیشتم . بابە تۆ ئەمبەیتە سەر «پیر سوەیل »؟! ها بابە ؟!

ـ ئا کوڕی خۆم .
ـ کەی؟
ـ ئێستا .. شەوە . سبەینێ زوو ئەڕۆین .
ـ بابە نایەڵی دوختۆرەکان بمبەن ؟!

ـ نا کوڕم .. سبەینێ زوو ، بەر لەوەی دوختۆرەکە بێت ، ئەتخەمە سەر ملمو ئەڕۆین .. بە باریکە ڕێگاکەی لای « کانی پەریان »دا سەر ئەکەوین ، تۆ ڕێگاکەت دیوە ؟! ڕێگایەکی زۆر سەرە ژوورو خزە ، بەڵام من ئەوەندە پێیا ڕۆیشتووم بست بەبستو ، تاوێر بە تاوێر شارەزایم .. جاران کە منداڵبووم چەند ماندوو بوایەم باوکم ئەیخستمە سەر ملیو پێش ئەکەوت، ئیتر منیش بە ئارەزووی خۆم سەیری ئەم لاو ئەولام ئەکردو لە هەڵخزان نائرسام ، بە باوکمیان ئەوت : « کورە زەلام دایگرە با بەپێی خۆی بڕوا ، خۆ منداڵ نییە » ئەوساکە من لە تەمەنی ئیستای تۆدا بووم ، گەرمیانو کوێستانمان ئەکرد ، جاری وا هەبوو تا تاریك دا ئـەهـات ئەڕۆیشتین . باوکم زۆر بەهێز بوو ، هەموو جـارێ بـەوانی تری ئەوت : « ئەها کوڕگەل ! شەرم مەکەن ، پیاو ژن هەر کەسێکتان پەکی کەوت تا کوێی ئەوێ ئەیخەمە سەرشـانم » . زۆر جـار بـەکۆڵیەوە سـەر خەوێکیشم ئەشکاند ... جـارێکیان بەسـەر ملیەوە خـەوم لێکەوتبوو ، لە فڕەی باڵی سوێسکەیەك راچڵەکیم ، حەزم ئەکـرد وەکو ئـەو بـاڵەکانم بکـەمەوەو بـەرەو دۆڵە قووڵو سەوزەکەی « جنۆکان » بەرەو خوار ببمـەوە ، بـاوکم وتی : «کوڕم تۆ سوێسکە نیت ، بەرەوە ئەبیو هەپروون بە هەپروون ئەبی » ، ئیستایش کە خەو ئەبینم ئەبـم بە سوێسکەو بـە فڕەی باڵێك لە سەر لوتکەکەوە بۆ ناو دارستانەکە بەرەوخوار ئەبمەوە ، بەڵام هەرکە قسەکەی باوکم بیر ئەکەوێتەوە ، تـرس دامئەگرێتو باڵم پەکی ئەکەوێتو بەرەوە ئەبم ، هەر چـەند ئەکەم ناگەمە زەوی ، تا لەترسا بەئاگا دێمەوە .. بـەڵام تـۆ مەترسە ، من دەستت لێبەرنادەم و نایەڵم بکەوی، ئەمجارەیان بەرەو « دۆڵی جنۆکان » دانابەزین، بەرەو لای ئەستێرەکەی تۆ ئەچین .. باشە بابە ؟!

ئاوڕێکی لە کوڕەکەی دایەوە ، بە ئەسپایی ناوشانی لـە قەرەوێلە سپییەکەی کوڕەکەی کردەوە ، بەسـەر چیچکانەوە ملی قوت کردەوە ، ئەو چاوی لێکنابوو ، زەردە خەنەیەکی گەرم بەسەر روخسارییەوە بوو ، زۆر لە ئاوە روونەکەی « کـانی پەریان » دەچوو ، کە لە ڕۆژانی بەفرانبارو سەرمادا دڕ بـە بەفرەکەی سەر ڕێگای بداتو ، بەرەو «گۆمە زەردە » بەرەو خوار ببێتەوە .

لەبەر خۆیەوە وتی :

ـ دایکت بەم هەواڵە بزانێ چی لە خۆی ئەکا !؟ بـەچی روویەکەوە من بتبەمەوە ناو دێ ڕۆڵە گیان ؟! کەی ئیتر هێزی ئەژنۆم ئەمێنێ بتخەمە سەر ملمو بتکەیەنمە سەر لوتکەی « پیر سوەیل » ! ... نا ... بۆ ئێمە مانان نەهاتووە بەبێ لاق بژین! خۆ ئێمە دارو درەختی « دۆڵی جنۆکان » نین ! ئیمە ماسیو سوێسکەیش نین ! کە بێدەنگ بوو ، جگە لە گوڕەی ئۆتومبیلە تیژرەوەکان هیچ دەنگێکی تری نەدەهاتە گوێ . پشتی دایـە کاونتەرەکەوەو هەر دوو ئەژنۆی نووساند بەسـینگەوەو چاوی لێکنا :

[ ـ سبەینێ زوو هەڵتئەگرمو ئەڕۆین ، لانادەینە ناو دێ بە توولە ڕێیەکەدا ئەڕۆین راناوەستین تا ئەگەینە سەر لوتکەی « پیر سوەیل » کە دنیا تاریك داهات ئەستێرە بچکۆلانەکـەت دەر ئەکەوێ ئەمجارە لە سەر لوتکەی « پیر سوەیل » نابێ زۆر دوورترە پێم ئەڵێی باخۆمانی بۆ هەڵدەین تۆ بیر لـە دۆڵی جنۆکان ناکەیتەوە چەند قووڵو هەزار بە هەزارە شەوە دنیـا تاریکەو دیارنییەمن قسەکەی باوکمم بیر ئەکەوێتەوە پاشەو پاش

ئەگەڕێمە دواوە تۆیش بەهێـزترم ئەزانیو هـەڵئەبەزیتەوەو بەپێ ئەکێشی بە قەبرغەما بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بتبـەم قسەکەی باوکمم لەبیر ئەچێتەوەو خوێنی سوێسکە بەدەماری باڵەکانما ئەگەڕێ سەیری خوارەوە ناکەم چاو ئەبڕمە ئەسـتێرە بچکۆلانەکەتو خۆم هەڵئەدەم سووك وەکو سیمرغ بەرزئەبمەوە یەکەمجارم ئەبێ قسەکەی باوکمم بیر نەکەوێتەوەو بەرەوە نەبمو بەدەم ترسەوە لە خەوەکەم رانەپەڕم ئەتبەم تا بەدەستی خۆت دەست لە ئەستێرەکەت ئەدەی راناوەستم باوکم منی فێـرە فڕین نەکرد بەڵام ئەبێ من تۆ فێرە فڕین بکەم چونکە دڵی ئەوەم نایەت هەتا هەی بە پاڵکەوتووی بتبینم ئێمە پشتاو پشت هەر

بەپێوە گیانمان دەرچووە نامەوێ لەمە زیاتر بـــە پالکەوتوویی ببێنم کە تازە زمانت دەبڕا ئەگەر داوای شتێکت بکردایـەو بۆتم نەکردایە ئـەتوت ئیتر کوڕی تۆ نابم ئەی ئیستا بۆ وا بێدەنگی بەشەکەم ؟! . نازانم ئەمشەو بەبێ ئەوەی چاوت بـە ئەستێرە بەرزە بکەوێ چۆن خەوت لێکەوت خۆ ئەوە دوو ســێ هاوینە تا لە نێوان منو دایکتدا خەوت لێنەکەوێ هەر باسـی ئەستێرە بەرزەو گەیشتنە لای ئەوم بۆ ئەکەی نازانم بۆچی لە ناو گشت ئەستێرەکاندا تەنها ئەوت بەدلەوە نووساوەو بەهی خۆتی ئەزانی باوەڕ ناکەم ئەستێرە ناسەکانیش ئەو ئەستێرەیەی تۆیـان بەبیرا بێتو حیسـابی بەختی خـەلکی پێبکـەن چ فریشتەیەك ئەو ئەستێرەیەی بردۆتە دلتەوە رۆلەکـــەم خۆ ئەگەر راست بوایە ئەستێرەی تۆ بوایە ئەبوو وەك ئەســتێرە ناسەکان ئەلێن ئەستێرەت بەرز بوایەو بەم دەردە نەچوویتایە تاقانەکەم .

کە چاوی هەلهێنا دنیا روناك ، زۆر روناكو سپی بوو ، نە خۆرو نەهیچ شتێکی کەی لێوە دیار نەبوو ، ئافـــرەتێکی ئاودامان سپی بەدیار سەریەوە راوەستابوو، بەزەردە خەنەیەکی ناسکەوە پێی وت :

ــ ئەی بۆ بە ئێشکچییەکەت نەوت بەتانییە زیادەت بداتێ لەسەری بخەوی ؟!

کە ئاوڕێکی بەم لاو ئەو لای خۆیدا دایەوە و چاوی بـــە کوڕەکەی کـەوت . دوێنێ شەوی بیر کەوتـەوە . ویستی هەلبسێتە سەر پێ ، لە ئەژنۆی بەخوارەوە کــە ســەری خستبووە سەری دەتوت پێیەوە نەماوە ، کسپەیەك لـە ناخی هەلساو هەر زوویش هاتەوە سەرخۆی، ســتەرەکە پێی وت:

ــ لاقت سڕ بووە ، تۆزێ درێژی کە با تەزیی دەرچێت ، چۆن بە دانیشتنەوە خەوت لێکەوتووە مالوێران ؟! زووکـــە دوکتۆر ئەلێ ئەمڕۆ یەکەم عەمەلیات کوڕەکەی تۆیە .

ــ عەمەلیاتی چی ؟! لاقی ئەبڕنەوە ؟! نەخێر . ئەگەر پێتان چاناکرێتەوە وازمان لێبێنن کارتان راست بێ ، ئەیبەمەوە .

ــ کاکە برینەکەی لێی پیس کردووەو هیچ چارێکی تری نییە ، ئەگەر نەیبڕنەوە ئەیکوژێ .

ــ قەیناکا .. بمری لەوە باشترە .

سەیرێکی کوڕەکەی کرد . دەستی خستە سەر نـــاو چەوانی .

ئەو چاوی هەلهێنا . ئـەم وتی : ــ « هەلۆ » هەستە کوڕم ، با زوو بکەوینە رێ . نەمرم ئەمڕۆ پێش ئەوەی دنیا تاریك دابێت ئەتگەیەنمە سەر لوتکەی « پیر سوەیل » .

# ٢.. سکی تێ

سەلام مەنمی

## (١)

گەیشتە ئەو شـارەی بۆی نێررابوو ، وەك مەڕی گێژ بە دەوری خۆیا ئەخولایەوە لەشی قورس بوو بوو .. سەری هەلبڕی ، لەو بـەرەوە نووسرابوو ( ئوتێل کامـەران ) .. ( با بچمە ئەم ئوتێلە هەر چەند کامەران نیم .) بۆیەکە پێشی کەوتو ژووری ژمارە شەشی نیشان دا .. چووە ژوورەوە ، بیجامەکەی لەبەر کرد ، نەعلەکانی لەپێ کردو دەستی شۆری..

لەسـەر قەرەوێلەکە دانیشت ، دەستی بەزەنگەکـەدا نا ..

پاش چەند دەقیقـەیەك لێی دایـەوە ( چۆن ئوتێلێکە ئەلێی چۆ ـ ـنیەو وەك ئەشکەوت دەنگ ئەداتەوە ، سوراحیـەکی رووتو قووت لەسـەر تەپلـەکێك دانـراوە .. ئـەی ئـەم چەرچەفـو سـەرینە بۆ نالێی بیان گوشیتـە دەمی مار پەتۆ نابات ، خۆ قرە قرو زرمە زلێی قاتی خوارەوە هەر بـاس ناکرێ ، ئەلێی مەزاد خانەیە .. حالم زۆر خۆشبوو ، هـەر ئەوەم کەم بوو مەیموون لە خۆیا نەبوو ئاولەیشی دەر کرد.. منی بار گران هەر ئەبێ ئوتێلی وام دەست کەوێ .. بەلام هێنانو بردن ، چەوسانەوە ، بەجێ هێشتنی مالو مندال هەر هەموویان بە پەرێزی کۆستە گەورەکەمدا ناچن ، ئـەو کۆستە، مرۆڤی بەرەو شێتی ئەبردو بـەری رۆژی گرت ، تە[illegible] [illegible]نی هەلوەشان . جار جار تارمایی مندالەکانم دێتە [illegible] [illegible]و ئەلێن :

کەی دێیتەوە ..؟
زۆرت پێ‌ئەچێ..؟

ئەگەر بلێی ناهەقیان نیـە ، ئەوەتەی هەن منیان وەك میوان دیوە .. ئەمانە هەرچەن پارچـەیەکن لە جگەرم بەلام ئەمانیشیان لەگەل ئەو رۆژەدا بـەراورد ناکرێ .. سەختی ئەو رۆژە وەســف ناکرێ ، سەگـەر گۆرانی شـاعیر بتوانێ وەسفی بکاتو کارەساتەکان بەیەکەوە ببەستێ ..

(٢)

چووه لای بەڕێوەبەری فەرمانگەو فەرمانی ئیداری دابە ، ئەویش کورسییەکەی سوڕاند ، چاویلکەکەی لە چاو کرد ، خوێندیەوە ، هەندێ مات بوو ، سەری هەلبڕی:

— ناونیشانەکەت سکرتێر بوو ..؟

— بەلێ ...

— لێرە ئەو ناونیشانە گیراوە ..

— جەناب لێرە هەر نیە ..

— بەلێ ڕاست ئەکەی خۆم سکرتێرم .

— جەنابت بەڕێوەبەرە ..

— جیاوازییان نیە .. وا لە بەشی ئەرشیف دام نابت ..

— هەر جێگەیەك بێ باشە ..

( دیارە زۆر گەمژەیە .. وا ئەزانێ سکرتێرییەکەیشم بۆ ئێرە گوێزراوەتەوە .. بەلام مرۆڤ لەگەل کێ مێشکی خۆی ماندوو بکات ، هەتا کەر تێ ئەگەیێنم خۆیشم گوێم درێژ ئەبێ .)

(٣)

لە بەشی ئەرشیف دایان نا چوار کەسی تریشی لێ بوو ، یەکێکیان وتی :

— ئەم بەشە ئەوەندە فەرمانبەری ناوێ ، کارو پیشەمان قسە کردنە ..

یەکێکی تریان وتی :

— کاتێ خۆی بەڕێوەبەر لەم بەشە بووەو ئێرەی لەبیر ناچێت هەرچی دێ ئەنێرێ بۆ ئێرە ..

( ئەمانیش ئەیناسن .. هەر زوو زانیم واوی (وەحە )ی لە مێشکا نیە . .بەلام ئەلێی چی .. ئێرەکەیش بەشەغرەوە پەیەڕێ بەدووری مەزانە .. ئەمانەیش وەر. بوون ، بۆیە بێ پەروا لەکەولی خۆیان دەرچوون ... ).

(٤)

بەڕێوەبەر بە شوێنیا نارد ..

— ژوورەکەت باشە ..

— خراپ نیە ..

— چوار کەسن ..

— نەخێر بەمنەوە پێنج ..

— ئەوەندە سەرم قالە ئاگام لەخۆم نیە .. ئەمەوێ قسەیەکت لەگەل بکەم ..

— فەرموو ...

— ئەگەر بەقسەم بکەیت و لەگەلمان بیت . ئەت خەمەوە جێگەکەی خۆت .

— وتم جێگەکەی خۆم لێرە نیە

— لە هەر جێگەیەك بێ ئاسانە ..

— گرنگ جێگە نیە

— ئەی ... ؟!

— دلسۆزیو نابەتوانایە ..

— قانجاز ناکەیت ..

— هەتا بینەقاقام لافاوی زیان دای پۆشیوەو هیچ کارێ نای هێنێتە قوڵە ..

— .. .. ..

زەردە خەنەیەکی دەست کرد بەڕوویەوە دەرکەوت و لە دلی خۆیا وتی : ( سەیرە ، ئاگای لە فەرمانگەکەی خۆی نیە کەچی ئەیەوێ من فریو بدات ، ئەگەر بلێی ئەمانە قسەی خۆی نین .. بەلکو پێیان وتووە ، بەلام نازانی بیان گێڕێتەوەو سەرو پۆتەلاکی زلراوەکان ئەشکێنێ و ئابڕووی ئەو کەسەی بردوە فێری کردوە ... )

جارێکیتر بانگی کردەوە .. خەریك بوو لە پێستی خۆی دەرچێ ، : ( وازم لێ ناهێنێ ، بەڕوویا ئەتقەمەوە ، چیم هەیە .. ئەوەی هەم بوو نەما .. حەزم ئەکرد خۆیشم بەدوایا بڕۆیشتمایە. .. بەلام گیان لە جێگەیەکی سەختایەو بە ئاسانی دەر ناچێ ... )

— فەرموو مامۆستا ..

( فەرموو .. مامۆستا .. کەی بووم بەما ..؟!)

چەند پرسیارێکی لە بارەی فەرمانگەوە لێ کرد .. ئەویش وەلامی دایەوە ..

— وا دیارە شارەزایت ... ؟

— ئەمانەم لە زانکۆ خوێندەوە ..

— زانکۆ ... ؟!

— بەلێ زا ...

— ئەی جەنابت هەتا چ پلەیەکت خوێندوە .

وەسیقەی دووی نـاوەندیم هەیە ، بەلام خوێندنەوەم زۆرەو ئاگاداریم هەیە ، خۆت ئەزانی بەڕێوەبەری بەخۆڕایی چنگ نـاکـەوێ ... لەمـەو لا لەبەشی ئـەرشیف ئـەت گوێزمەوە ..

ـ کورسی پەشتە مالی حەمامە ..

( بـەخۆڕایی بەڕێوەبەری چنگ ناکەوی ـ بەملم بـە خۆڕایی کراویتو باش حەمالی گومرك پڕ بەپێستەکەتە ..)

(٦)

باشبوو بۆ ئەوە بانگی نەکردم .. بۆ بەرژموەندی خۆی بانگی کردم هەر چەند ئەوەیش بەرژەوەندی خۆی تیا بوو ، ئەو کورسییـە هـەلوێستو ویژدانێتی .. سـەرم لـەوە سوڕماوە بۆچی پرسیار لە من ئەکات لەگەل ئەوەیشا لە من شارەزا تری لێیە ..؟! بە بۆ چوونی من لەبەر ئەوەی خۆی لەبەشی ئەرشیف بووە ، لـە ڕووی نایەت پرسیـاریان لێ بکات .. منیش بەغەریب ئەزانێ و ئەلێ کەس پێم نازانێ ، ڕاستیش ئەکات .

بەلام هەتا با لەم کونەوە بێ وەك کەلەشێری بلقاسـمە لە وەخـتو ناوەختـا ئەخوێنێیو گالتـە بەویژدانو یاسا ئەکات .

# هەڵسەنگاندن

■ ئەکرەم قەرەداخی ■

## چیرۆکی یەکەم :

### ( تابلۆی دیرە رەوگەیەکی کاروان )

ماوەیەکی زۆرنییـە محەمەد سـالح سەعید چیرۆکی کورت ئەنوسێتو بلاوی دەکاتەوە. لەگەل ئەوەی نوسـەرێکی پەنجاکانیشمانە ، چونکە تائێستا خۆی بە چیرۆکی درێژەوە خـەریك کردوەو لەم لایەنەشەوە تا ئیستـا ، سێ بەرهەمی بلاوکردۆتەوە (کاروانی، شمشالی شوان، ئاشتی کوردستانـ) بەم چیرۆکـەشیەوە، پێنج چیرۆکی کورتی نوسـەرم دیوە، کە تەنها دووانیان بلاوکراونەتەوە .

ئەگـەر بشێت هـەر لە سەرەتـاوە باس لە شێوازی نوسینی ئـەم چیرۆکە بکەم. ئەبێ بلێـم هـەتـا بلێیت تەمو مژاویو پڕ لە رەمزو بەکارهێنانی ووشەی دوو دیوە، لەبەر ئەمە، خوێنـەر بەتەواوی ئەکـەوێتە نـاو گێژاوی بێ بنی گومانو تێنەگەیەشتنـەوە، چجـای گوێگر لە کۆڕێکی وەك ئێرەشدا،

رەنگە لەپاشدا هەولدانو ئەملاولا پێکردنی چیرۆکـەکە لای خوێنـەر زۆر شت روون بکاتەوە، گەلێك رایەلی باشی وای لادەستگیربێ کە بتوانێت لە مەبەستەکان بگات . بەلام من هەر چۆنێك‌بێ ناچارم لێرەدا خۆم بەرەخنەی شیکردنەوەوە ببەستم، تا بتوانم لەو کلاورۆژنەیەوە، تیشـك بخەمە بـەر هەندێك لەو گۆشانەی نوسـەر ویستویەتی وێنەیان دەربخات.

من بەش بەحالی خۆم ئارەزووی خوێندنەوەی چیرۆکی وا ناکەم . حەز ئەکـەم چیرۆك زوو بچێتـە ناخمەوەو زوو بمهەژێنێو کەسەکانی زۆر لام بمێننەوەو لە گەلیاندا بژیم، هەلبەت کە ئەمە ئەلێم مەبەستم لەوە نییە کە نوسـەر راستو رەوانو بێگرێ کلافـەکانی مێشکیم بۆ بکاتـەوە ، چونکە زۆر چاك ئەزانم کە بۆچی نوسـەر پەنا ئەباتە بەر رەمزو نیشانەو ئەمدیوو ئەو دیو لـە چیرۆکدا، لەگەل ئەوەشدا هەرگیز ئەو حەقەشی پێ نادەم کە چخوێنەر و چ گوێگر بخاتە چەواشەیەکی واوە سەری کلافە دمزوەکان بە تۆسقال بدۆزێتەوە ..

بەلای منەوە ؛ ئەم چیرۆکە بارو دۆخێکی ئەوتۆی تیـا رەخساوە کە لە بوارێکی پڕ لە هێماو سەرنجی تیژو خێراو ئیشارەپێدانی سـەرپێی نەبێ، رەخنـەگر ناتوانێت ئەوەی هەیە، رووونی کاتەوەو بێ هیما بە خوێنەری بگەیەنێ چونکە ئەوسا کاری نوسـەر چەند گرانە، رەخنەگرەکە دەها ئەوەندە کارەکەی بـەگرانتر بۆ دەرەخسێ . لەگەل ئـەوەشدا هەر ئەلێم نوسـەر ئەیتوانی ئەم کارە تەواو لەو تەمو مژە دەرکات ئەگەر دایـەلۆگەکـەی رەوانترو شفافـتر بوایـەو ئەوەندە ووشەگەری بەکار نەهێنایە .

کەسانی ئەم چیرۆکەی محەمـەد سالح سـەعید، لای ئێمە نەناسراوو نائاشنانین، بەلکو بەدەیـانو سـەدانیان لێ بەدی ئـەکەینو ەـەربەم کۆمەلـەنو لێمـان جیـا نابنەوە لەگەلیاندا رەفتارو هەلـوکەوت ئەکەین .

چیرۆکەکە زیرەکانـە پەردە لەرووی بارێکی کۆمەلایەتییو رامیارییو مێژوویی وورد هەلئەداتەوە . بەنەرمیو ووردی بۆ مەسەلەیەکی گرنگ ئەچێت، ئەویش مەسەلەی خۆ دۆڕاندنە . پەردە لەرووی ئـەو کەسـانە هـەلئەداتەوە کە لەپێنـاوی بەرژەوەندی تاکە کەسێتی خۆیاندا هەموو نەرێتو رەوشتێکی کۆمەلایەتی پێشێل ئەکەنو ئەبنە داردەستو کلك لە بەردەم ئەمو ئەودا .

نوسـەر لە گۆشـەیەکی بچوکو لەنـاو چـایخانەیەکی جەنجالدا، وێنەیەکی ئەم بارە ناهەموارە دەرئەخات . ئەوەتا (چۆك)، کابرایەکی ترسنۆکو خۆویستو دۆڕاوە. کابرایەکی بوچەلی، سەر لێشێواوو پاشـەڵ پیسە . لەگەڵ ناحەزانی کۆمەلانی خەلکیدا دەستی تێکەڵ کردووە . هەموو هەستو نەستێکی بۆتە ماستاو کردنو خۆ بردنە پێشەوە لە گەورەکانی.

(جلفر)، نمونەیەکی تری بێ ئابڕوییە، جگە لە دۆڕاندن، خۆفرۆشیشە، جلخۆرە، ئەم کەسـە، هیچ شتێکی بـەلاوە گرنگ نییە، خۆیو گەورەکانی نەبێت . ملی دەهاو سەدان ئەشکێنێو سەرمەو قولاتیان پێئەدات لەپێنـاوی مەبـەستە نەخۆشەکانی خۆیدا، (ملفیچك) کابرای ملقەویو لووت بەرزە، یەکێکە لەبەرەی ناحەزانی خەلکەکەو داردەستێکی گەورەیە، کەسانی وەك جلفرو چۆك، ماستاوی بۆ سارد ئەکەنەوە، مالی خۆیانی پێش کەش ئەکەن . ئەویش بەپێی ئارەزووەکانی خۆیو گەورەکانی هەلیان ئەسوڕێنێت . (چۆك) کابرایەکی دۆڕاوە، بەلام (جلفر) جگە لە دۆڕاویەکەشی مل شکێنیشە . قەپگرو باشقول گرە ، بەلام ئەم ترسنۆکانە، هەر کە چەپۆکی کۆمەلانی خەلك بەتاوتر بوو خۆیـان ئەخـەنەوە قاوغو سـەدەفەکەی خۆیانو جارەجارە کەسێکی وەك (چۆك) هەولی ئەوەش ئەدات بەرەو خەلکەکە چەند هەنگاوێك بێتە پێشیشەوە . (زیت)، کەسێکی ئازاو چاپۆکو لێهاتووی رۆشنبیری خەلکە بەرەنگاری لایەنە دۆڕاوو خۆخۆرەکە ئەبێتـەوە . رێگا لـە کارەکانیان ئەگرێتو مەچەکو بیری بەکار دەهێنێ بۆ چەپۆك داهێنانەوەو بنەبڕ کردنیان .

( دەنگ) ، نوسەر وەك دەنگی خەلکەکە دایناوە ، لەرێگای ئەوەوە دەنگی کۆمـەلانی خـەلکی بـەرز ئەبێتـەوە لەسـەر شانۆکەوە . ئەچێتـە بـەردلو گوێو چـاوی خـەلکیو لەو رێگایەشـەوە فەلسـەفـەی نـوسـەر ئـەدرێـت بـەگوێی دانیشتوانـدا .. وەك ئەلێت : «مریشك خۆی خۆل نەکات بەسەری خۆیدا کەس نایکات بەسەریدا ... » .

یان ئەلێت : «جاران دەرگاکانمان بەکلیلو کولۆم بوو. دەستی شارەزای خۆمانە نەبوایە نەیدەکردنەوە»» .

(دێرین)، باوباپیرانی کۆنن، نوسەر بە ئەنقەست هەلی بژاردوون، ئەیەوێت لەو لایەنەوە، دەنگی نەوەی نوێ تێکەڵ بەدەنگی ئـەوان بکاتو لەمـەوە تفـاعولێکی رۆحیو مـادیو داینـەمیکی دروست بکات ، هـەلبـەت ئەم کارە سەختـە، کەسـانی چیرۆکـەکە هـەر یەکە بەپێی عـالەمە تایبـەتیو گشتییـەکەی خـۆی بیر ئـەکاتەوەو لـە ئـەنجـامی ئـەو بیرکردنەوەیەشدا ئـەدوێن . بەمە نوسـەر بـەرگێکی درامی کردوە بەبەر چیرۆکەکەداو دایـەلۆگی کردۆتە فۆرمی سەرەکی تەکنیکی چیرۆکەکە . لەبەر ئەوە چیرۆکەکە زەق وەك چیرۆکیکی شانۆیی رووت دەرئەکەوێت نەك چیرۆکێکی کورت . ئەبوایە نوسەر هەر بـەم دایـەلۆگە رووتـەوە نەوەستایە. بەلکو ج لەرێگای گێڕانەوەوە ، یا وەك چاودێری شانۆکە. یا وەك دەنگی ناوەوە، یا وەك مۆنتاژ بە زیرەکانە یارمەتی خوێنەری بدایە بۆ روون کردنەوەی دایەلۆگەکە . واتە دایەلۆگەکە لە خزمەتی رووداوەکاندا بوایە نەك بەپێچـەوانەوە کـە بەلای منەوە ئەم فۆرمەی نوسـەر بەرگی چیرۆکەکەی گۆڕیوەتەوە بە بەرگێکی درامی رووت . راستە دراما ئەگەر کەوتە خزمەتی رووداوەکانی چیرۆکی کورتەوە، بەکارێکی شیاوولەبار دائەنرێت، بەلام ئەگەر بەرگە درامیەکە بەشەکانی تری پسان، چیرۆکەکە ئەخنکێنێ . ئەمە جگە لەوەی ئەوەندەی من هەستم پێکردبێ زۆرە ملێو هەناسە پسـانێکی زۆر سـەپێنراوە بەسـەر ووشـەکانداو دایەلۆگەکەی مراندوە . جگە لەوەی کە دایەلۆگەکە هەریەکە بەتەواوی تەعبیر لە کەسەکە ناکات، بەلکو هەموویان ئەلێی نوسـەر خۆی قسە ئەکاتو خۆینەر هیچ هەست بە جیاوازی زەمینـەی رۆشنبیریو کۆمەلایـەتیو چینـایەتیـان ناکات . وەك ووتم ؛ کەسەکانی نوسەر واقعیـەو لەژیانی رۆژانەماندا هەنو زۆریشن .

لە کۆمەلانی دوواکەوتودا، لە ئەنجامی پالەپەستۆی زۆری کۆمەلایەتیو پیلەبازییە چینایەتیەکاندا، کەسانی وەك چۆکو جلفرو ملفیچك بە ئاشکرایی دەرئەکەونو کەسانی وەك زیتیش وەك رابـەر ئـەبنـە پالنـەری کاروانـەکـە بێڕوا هـەولی

بەرەوپێشەوە بردنی ئەدەن . بەڵام ئایا ئەم (زیت)ەی نوسەر نمونەی ئەو کەسەیە کە ئەم توانایەی لەباردا بێت؟ راستە (زیت) کەسی کۆمەڵەکەیەو ئازارو ئاواتەکانی گرتۆتە باوەش، پڕ بەپڕ لە ئازارو سۆیکانیاندا دەژی، خاوەن (وەعی)یەکی کۆمەڵایەتیو رامیاریە، ئەم بارەش پڕ بەپڕ بەستراوە بەبنکەی ئابووری‌وکۆمەڵایەتیەوە، چونکە تا بنکەکانی هۆکانی بەرهەم هێنان فراوانتر بن ، کەسانی وەك زیت زۆرتر لە بارێکی تاك رەویەوە ئەبنە بنکەیەکی جەماوەری سەختو پتەو لەریزی هەرە پێشەوەی خەڵکەدا ئەبن بۆ وورباکردنەوەو چاوکرانەوەو راپەراندنیان ..

ئەم (زیت)ەی مەحەمەد سالح سەعید خاوەن (وەعی)یە، بەڵام بەرووکەشیو سەطحی . زیت سیفەتی پالەوانێکی شۆڕشگێڕی تیانی‌یە ، ئەگەرچی نوسەر ویستویەتی وا دەری بخات ، چونکە جگە لەوەی کە تاك رەوێتی‌یەکی زەقی تیا بەدی ئەکرێت ، هەست ئەکەم توشی ئۆرۆستۆکراتی رۆشنبیریش بوە ، سەر بە چینەکانی نیمچە بۆرژوا یا سەروتریشە ، چونکە کەسانی رۆشنبیری ئەم چینانە ، تەنها لەگێتی رەفزە رووتەکەد ئەژین ، مەبەستە سەرەکیەکانیان لە کۆڕی تێکۆشـــــاندا وونەو ئاشکرانی‌یە راستە زۆربەی زۆری ئـــەم رۆشنبیرانە ، ئازارەکانیان زۆرجار تێکەڵ بە ئازاری رەشایی خەڵکەکە ئەکەنو لەگەڵیاندا ئەژینو زۆر جاریش تەعبیر لە خواستو ئاواتەکانیان ئەکەن ، بەڵام رەفز کردنەوەی بارە واقعیەکـــە بەتەواوی گوم ئەبێو ئەچێتە گێژاوێکی واوە کە زۆرجار بە ( رەفزی تطرفی) یا ( ناموضوعی ) دەر ئەکەوێت .

خوێنەر زوو هەست ئەکات کە زیت ئەوەی‌یە بە تەواوی خواستی جەماوەرەکە بگرێتە باوەش ، چونکـــــە پالەوانێکی شۆڕشگێڕ کە هەڵقوڵاوی چینی چەوساوەی کۆمەڵەکە بێت ، تەنها،سەرنجدانو توانج تێ‌گرتنو قسەی لاقرتێ‌وە راناوەستێ، بەڵکو هەوڵو کۆششی تێکەڵ ، هەوڵو کۆششی گشتەکـــە ئەکات بنکەی تێ‌کۆشانەکە تابێت فراوانتر ئەکات .

لەگەڵ ئەوەشدا بەرای من ( زیت ) پالەوانێکی ئیجابی‌یە، سەر بەکۆمەڵەکەیە ، بەڵام پالەوانێکی شۆڕشگێڕ نی‌یە ، واتە ناتوانرێت قورسایی گۆڕینی بارەکەی بەتەواوی پێ‌بسپێرێ ، تەنها ئەوەندەیە کە ئەتوانێت رۆڵێکی باش ببینێت لەوورپـــا کردنەوەی خەڵکی‌داو کارێکی باشی هەبێت لـــە پـــەردە هەڵماڵینەکەدا ، هەرچەن رۆشنبیریش تـەنها بەس‌نی‌یە بۆ دروستکردنی پالەوانێکی نمونەی شۆڕشگێڕ ، چونکـــــە رۆشنبیری هەلپەرستو بەزیوو یاخی‌بوو ، ونهلستیش هەیە.

هەڵبژاردنی ( دێرین ) وەك دەنگی باوانو باپیران کارێکی چاکەو تفاعولێکی دینامیکی راستە بەتایبەتی نوسەر زیرەکانە هەندێك لایەنی مێژوویی تێکەڵ بە دایەلۆگەکانی دێرین ئەکاتو نمونە لەسەر کۆششو هەوڵو نەپساندنی زنجیرە کاروانەکـــە ئەهێنێتەوە .

شیعرو شفافیەتی شیعر لەکاری چیرۆکدا بایەخێکی چاکی هەیەو دڵو دەروونو گیانی خوێنەر رائـــەکێشێت ، وای لێ ئەکات زۆرتر بچێتە قوڵایی چیرۆکەکەوە ، لەهەمان کاتدا جۆرە فەرامۆشیەك ئەداتە هەستو خۆشیەکی تایبەتی پێ ئەبەخشێ. ئەو شێوازە شیعریە بەداخەوە لای نوسەر وا نەهـــاتۆتەوە ، بەڵکو زۆرە ملێ‌یەکی تەواوی پێوە ئەبینم . من لە نزیکەوە ئەزانم محمد سالح سەعید کەڵکێکی زۆری لە ژیانی ماموستایەتی لە گوندەکاندا دیوەو لەپاشیشدا وەك سەرپرشتیاری پەروەردە ، لەم لایەنەوە نەپچڕاوە ، بەڵکو بەسەدان ووشەی خۆماڵی لـــە گوندو چیاکان خۆیان لە میشكو بیریدا جێ‌کردۆتەوە . بەڵام لە مامەڵەی ئەو ووشانەدا لەم چیرۆکەدا هەست بە هەناســـە سواری‌ووەڕس‌بوونی‌ی ئـــەکەم ، چونکە نوســـەر نەیتوانیوە بەتەواوی مامەڵەکە برەخسێنێ بەو جۆرەی کـــە خوێنـــەر هەست بە شەکەتی‌و ماندووبون نەکات . ئەمە جگـــە لەوەی دایەلۆگ ئەبێ سادەو رەوانو بێ‌گرێ بێ . ئەمـــەش تـــەواو پێچەوانەی کارەکانی پێشوی نوسەرە لە ( کاروانی‌و شمشالی شوانو ئاشتی کوردوستـــاندا ) . بەلای منەوە هەڵبژاردنی ووشەی گونجاوو سوك لەسەر زمان،ئەو ووشانەی کە راستەو راست مەبەست ئەدەن بەدەستەوە ، بەکارێکی مـــــەز ن دائەنرێن لە کاری چیرۆك نوسین‌دا . بە پێچەوانەشەوە ، گەڕان بەدوای ووشەی گرانو قورس‌دا ، ئەو ووشانەی خوێنـــــەر چەواشە ئەکەن ، بەکارێکی ناقۆڵا دائەنرێت ، چونکە خوێنەر لە مەبەست دوور ئەخەنەوەو ئیستاتیکی بەرهەمەکەش ئەشێوێنو تێکی ئەدەن .

من حەز ئەکەم نوسەر شێوازە سادە سفتو رەوانەکەی پێشویمان لێ نەشارێتەوەو ئەو شێوازەش کە خەریکە چیروك نوسانی خۆمان بەتەواوی وازی لێ ئەهێنن ، ســـەر لە نوێ بۆمان بهێنێتەوە .

کاری ئیجابی چیرۆکەکە لەوە دایە کە نوســـــەر ئەوەی گەیاندووە رێگاکان چەند سەختبنو رێبازەکان چەند کەسـك بنو رۆژەکان چەند تەماوی‌بن، رەوتی کاروانی هـــــــەر بەڕێوەیەو لەسەر زمانی باپیر (دێرین ) هاوار ئەکات کـــــە ببنە یەك دەنگو چاوەکان لەم پێناوەدا ببنە یەك چاو .

دەرکەوتنی ژنانی سك‌پڕ لەسەر رەوگەی کاروانەکە ، پەنجە راکێشانێکی جوانو زیرەکانەیە بەو ( زاین )ە نوێ‌یەی کـــــە کۆمەڵانی خەڵکی چاوەڕوانی ئەکەن .

## چیرۆکی دووەم :

((ئەستێرە بەرزە ))

ئەستێرە بەرزە هیمایەکە بۆ مەسەلەیەکی گرنگ، مەسەلەیەك کە پەیوەندی تەنها بە یەکێك‌و دووانەوە نی‌یە، بەلکو مەسەلەی خەلکەکەیە . کەواتە ئەستێرە بەرزە هیوایە، ئامانجە، رێگایە .

نەخۆشخانەیەکە لە شارێکی گەورەدا . منالێك هەردوو قاچەکانی توشی نەخۆشیەکانی وەك ئیفلیجی بوە . لەسەر نەرەوێلەکە بەپشتا کەوتوە . باوکیشی لە خوارەوە بەدیاریەوە چۆکی داداوە . شەوەو زۆریش نی‌یە باوکە منالەکەی هێناوەتە ئەم نەخۆشخانەیە . دایەلۆگ بەردەوامە لە نێوان باوك‌و منالەکەدا کە هەردووکیان دوولای مەسەلەکەن . باوك لەنەوەی پێش بەنجاکانە، لەوانەیە کە تاوێری گەورەی وەك هەرەسی دیوە . منالیش کۆرپەی ئەم رۆیە، تازە هەست بە دەوروپشتی خۆی ئەکات .

سەلاح لەم گۆشەیەوە، ووردە ووردە ئەمان خاتە عالەمەکەی‌و وەك کۆتر ئەمان خاتە شەقەی باڵ‌و بەرزمان ئەکاتەوە . لە عالەمێکی خەیالی‌داو بەلام نەك لەبەر مەبەستی خەیالێکی رووت، بەلکو خەیالێکی‌وا کە پڕبەپڕ خزمەتی واقعەکەی پێ بکات، واقعێك کە بەندە بە ژیان‌و گیانی خەلکەکەوە . منالەکە دلماوی دەستی باروەتە، ئەمە بەشێکی گەورەی مەسەلەکەیەو نیشانەیەکی زەقیشە تیایدا .. ماسیەکانی ئاوەکەش کە خلەرەش باروتیان تێ ئەگرێت، هەروەك منالەکە داماون‌و ئەکەونە سەر ئاو .

منالەکە خۆی لە خۆی‌دا هێمایەکە بۆ لایەنێکی تری مەسەلەکەو نەوەی نوێ‌و سەردەم ئەگەیەنێ داوای ئەستێرە بەرزە ئەکات . باوك ئەم داوایە بەرپەرچ ناداتەوە، بەپێچەوانەوە بلوەش بۆ داواکەی ئەکاتەوەو خۆی بۆ ئامادە ئەکات . لەژێر تیشکی بیرەوەریەکانی خۆیدا لەگەل باوکی‌دا (باپیری منالەکە) ئەکەوێتە دۆزینەوەی بیر بۆ رێگاکە . گیانی نەبەزین‌و وورە بەرنەدان ئەکات بەبەریدا .. تەلخی ئاسمان، بوونی شاری گەوزەو سوتاندنی نەوت، هیمایی بیری بەرزی چیرۆکەکەن .

بەلام تاك رەوێتی بە باوك‌و کوڕەوە دیارە . نوسەر باوك‌و کوڕەی بە ئاشکرا تێکەل بەدەیان‌و سەدان باوك‌و کوری‌تر نەکردوە . تەنها رێگا سەختە دژوارەکەی (کانی پەریان)و (ئەستێرە بەرزە)ی بە هەول‌و خەباتی باوك‌و کوڕەوە بەستۆتەوە .

هیوا تێکەل بەگیان‌و دل‌و دەروون ئەبێ . باوك ئەزموون‌و تاقی کردنەوەی خۆی ئەخاتە کار . بەلام ئایا بەتەنها ئەو تاقی کردنەوەیە بەسە بۆ هێنانەدی (ئەستێرە بەرزە) .. من بەش‌بە حالی خۆم کارەکە زۆر بەسەختتر ئەزانم ، هەست ئەکەم نوسەر (شمولیەت)ی کارە گشتیەکەی وون کردوە . جۆرە دابڕانێکی زەق بەدی ئەکرێت . کارێکی وا مەزن‌و گەورە پێویستی بە رێچکەی کاروانێکی نەپساوی درێژ خایەن هەیەو باوك‌و کوڕە ئەلقەی زنجیرەی کاروانەکەن تیایدا ...

سەلاح زیرەکانە بۆ (دۆلی جنۆکان) چوە. (دۆلی جنۆکان) رەمزێکە بۆ کارەساتێکی جەرگبڕ کە بەسەر کاروانەکەدا هاتوە . باوك خۆی (معاناتی) لەگەلدا هەیە . کەسەکانی سەلاح عەودالی گێتیەکی بێ خەمن کە ئازارەکان تیایدا سارێژبن‌و سۆێکان چاك ببنەوە گێتیەك کە هەلۆ قاچەکانی چاك بێتەوەو باروت ماسیەکان‌و قاچی ئەمیش لەناو نەبات . کەواتە کەسەکانی سەلاح، وێل‌و ئاوارەو بێ ئاگانین، رێگاکەی خۆیان ئەزانن‌و ئەستێرە بەرزەش مەنزلگاو کاروانیانە ، ئەو عالەمە ئەفسانەیەی سەلاح دروستی کردوە، چیرۆکەکەی پێ رازاوەتەوەو جوانی کردوە، هەرچەندمن لەو باوەڕەدام کە زۆر جار سەپاندنی عالەمێکی رەمزی بەسەر بەرهەمێکی ئەدەبی‌دا بەکارێکی بنیاتنراو دانانرێ، واتە مەرج نی‌یە نوسەر لەسەدا سەد هێلێکی سەرەکی بۆ چیرۆکەکەی یا بەرهەمە ئەدەبیەکەی لەپێشەوە بەرەمز کێشا بێت، بەلکو بەرهەمەکە وەك تعبیرێکی لاشعوری رێك، وەك رەمزێکی پەنگ خواردوی ئەودیو هەست (لاشعور) دەرئەکەون کە هەریەکەیان جێیەکی تایبەتیان لە دەروونی نوسەردا بەجێ هێشتوە . هەر لەراستیشدا چ (پیرسیوەیل) و چ (کانی جنۆکان) ، رەمزێکی حەقیقی مەسەلەکەن .

باوك کردارەکانی باوکی خۆی (واتە باپیری منالەکە) رەفز ئەکاتەوە کە کاتی خۆی نەیهێشتوە بکاتە کانی پەریان‌و ئەستێرە بەرزە، چونکە رێگای فڕینی لێ‌گرتوە . ئەگەر ئەم ئەزموونە لەلایەك بە تاکە کەسێتی بەکار نەهاتایەو لەلایەکی تریشەوە ببەسترایەتەوە بە بارو دۆخی کاروانەکەوە، هەلبەت ئەو کاتە رەفزی ئەوکردارە لەجێی خۆیدا ئەبوو . بەلام رەفز بەتەنها بێ بەستنەوە بە بارو دۆخی واقعەکەوە، بەلای منەوە بەرەفزێکی رووتی رۆمانسیانە دائەنرێت، کاروان بۆ ئەگاتە هەرەس؟! هەرەس لەکوێ‌یەوە دەست پێ ئەکات؟! برین بۆ پیس ئەکات‌و ئیفلیجی لە چیەوە پەیدا ئەبێ؟! برینەکان بۆ هەر ئەکولێنەوەو چارەسەر نابن ..؟! نوسەر بە (سطحی)یش نەچوتە ئەم لایەنانەوە، بەلکو هەر بەلایدا نەچووەو (کانی جنۆکان) نەیتوانیوە ئەمانە لەبەردەم خوێنەردا یەکالا بکاتەوە ئەمە جگە لەوەی نوسەر هەرپاش ئەو رەفزە، بە ئەوپەڕی شانازیەوە ئەڕوانێتە باوباپیران‌و بەزمانی باوکەوە ئەلێت — «ئێمەپشتاوپشت هەر بەپێوە گیانمان دەرچوە ، نامەوێ لەما

زیاتر بە پالکەوتویی بتبینم ». کەواتە باوباپیران لە کاروانەکە دوا نەکەوتون .. بەلاّم رێگاکان .. رێبازەکان .. ئەلقەیەك لەدوای یەکەکانی جۆری خەباتەکە لێ پرسراون ..

سەلاّح شوان لای من زۆرتر وەك شاعیر ناسراوە، بەرهەمی شیعریی جوانیم دیوەو تا ئێستاش ژمارەیەك چیرۆکیم خوێندۆتەوە . خاوەنی بەهرەیەکی ئەدەبیی چاکەو توانایەکی باشیشی هەیە لە تێڕوانین و سەرنجدان و گەڕان بەدوای دەردو بارە کۆمەلاّیەتیەکانمانداو لە هەلّبژاردنی کەسەکانیدا زیرەکە . سروشە شاعیریەتیەکەشی بە چیرۆکەکانیەوە دیارەو بەش بەحالّی خۆم پێی قارس نیم و حەزی لێ ئەکەم .

تەکنیکی چیرۆکەکە مەنەلۆژێکی جوانە . نوسەر زیرەکانە تێکەلّ بە کۆمەلّێ مونتاژی کردوە، لەرێگای گەڕانەوە (تداعی)یەوەو لە رێگای مەنەلۆژێکی ناوەوەی سایکۆلۆژی باوکەکەوە . ئەمەش جۆرە روونی و شفافیەت و جوانیەکی بە خشیوەتە چیرۆکەکەو زۆرتریش جلەوی لەبەردەم نوسەردا شل کردوە بۆ ئەوەی بەتەواوی شۆڕبێتەوە لەناخی کەسەکانیداو خوێنەر ئاشکرای دیوی ناوەوەیان ببێت .

زەمەن لە چیرۆکەکەدا شەوە، بەلاّم فراوانی دەریای زەمەنەکە درێژ ئەبێتەوە چ لەرێگای مەنەلۆژەوە چ لە رێگای دایەلۆگەوە، تا ئەیگەیەنێتە بەر فراوانی چەندەها سالێك و بە(کانی جنوکان) دای ئەخات .

لە هەندێك شوێندا رووی دەرەوەی چیرۆکەکە بە تەواوی خزمەتی رووی ناوەوەی (واتە روە رەمزیەکە) ناکات، بەلکو جۆرە پێچەوانەیەکی پێوە دیارە . من هیچ گلەیەکم لە نوسەر نی یە دەربارەی دیوی ناوەوەی چیرۆکەکەو زۆر باشیش بۆ مەبەستەکانی نوسەر چووم لەم دیوەدا .. بەلاّم دەربارەی ئەو دیوەی کە خوێنەری ئاسایی بەدی ئەکات، واتە رووی دەرەوەی چیرۆکەکە، نوسەر ئەوە ئەگەیەنێت کە باوکەکە نایەلّێت دوکتۆرەکان کوڕەکەی چارەسەر بکەن .. چونکە ئەو بەیانیە بریاریان داوە عەمەلیاتی بکەن .. باوکەکە هەر کەناوی عەمەلیات ئەبیستێ رەفزی ئەکاتەوەو بەکوڕەکەی ئەلێت :

«هەلۆ هەستە کوڕم با زوو بکەوینە رێ . نەمرم ئەمڕۆ پێش ئەوەی دنیا تاریك بێ ئەتگەیەنمە سەر لوتکەی (بیر سیوەیل) ... ».

لای من پزیشك رەمزی بەدفەڕی و جادووگەری و خواکانی خراپەنی یە .. پزیشك رەمزی پاکی و چاکی یە .. ئەبوایە سەلاّح بەشێوەیەکی تر ئەمەی دابڕشتایە ..

خالێکی تریش هەیە حەز ئەکەم لێرەدا باسی بکەم : دیاردەیەك لای زۆر چیرۆك نوسی تریشمان بەدی ئەکەم، ئەوەش نەنوسینە بەتەواوی بەزمانە ئەدەبیە یەکگرتوەکە، واتە زمانی ئەدەبیمان . بەلکو نوسینەکانیان هێج پێی بەچکە شێوە زمانەکانمانی پێوەیە بەپێی ناوچەکان، نەك لە ووشەو زاراوەکاندا بە تەنها بەلکو لە (تصریفی فعلەکان) یشدا . کە بەراستی نازانم .

بۆ نمونە سەلاّح لێرەدا ناوچە گەرمیانیەکەی پێوە دیارە ئەوەتا ئەلێت :

ئەوسای بریندار بووم ــ کە ئەبێت بلێت
ئەوسا بریندار بووم
ئەوها ئەڕۆین ــ = ئاوەها ئەڕۆین .
چەند مانلوو بوایەم ــ = چەند ماندو بومایە

---

چیرۆکی سێیەم ــ

## ( سکرتێر )

سەلام مەنمی چیرۆك نوسێکی دوای حەفتاکانە، واتە دەسالێك ئەبێ بەیتا بەیتا چیرۆکی کورت بلاّوئەکاتەوە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا، جگە لە دوو چیرۆکی درێژیش . ئەتوانم بلێم لەبەرهەمەمدا بەژمارە هیچ نوسەرێکی چیرۆکمان بەقەدەر ئەو بەرهەمی بلاّوکراوەی نی یە وەك من بزانم .

زۆربەی کەسانی چیرۆکەکانی سەلام واقعین و لەناو جەرگەی کۆمەلەکەمانەوە هەلّبژێراون .. زۆر جاریش شەفافیەتە خۆمالیەکەشیان بە ئاسانی پێوە بەدی ئەکرێت . زۆربەی بیرەکانیشی سەرنج راکێشەرن و خزمەتی واقعەکە ئەکەن . وەك نوسەرێکی چیرۆك، زوو هەست بە بارە نائاساسیەکان ئەکات و زووش ئەیان خاتە چیرۆکەکانیەوە . من چیرۆکی جوانی سەلامم دیوە ، بەلاّم ئەم چیرۆکەی ئەوم پێ نەبەخشیم . حەزیش ناکەم دانیشتوانی ئەم هۆلە، ئەم چیرۆکەی سەلام وەك نمونەی تەواوی بەرهەمەکانی وەرگرن، چونکە چیروکی جوانتری هەیە .

بە هەرحالّ : چیرۆکەکە لە فەرمانبەرێك ئەدوێت کە گواستراوەتەوە، بۆ شارێکی ترو لەمالّو منداڵو کەسوکاری هەلکەندراوە، لەویش وازیان لێ نەهێناوەو ویستویانە مەلحەمی بدەنێ، چەوری کەن ..

ئەویش بە هەمو بڕوایەکەوە رەفزی مەلحەمەکە ئەکات، سەلام زیرەکانە بۆ بیرەکە چوە، (وەك بیر) . بەلاّم دارشتنی

ئەو بیرە بەداخەوە وەك (چیرۆكێكی سەركەوتو) بەدەستیەوە نەهاتوە، بەلكو هەر زوو خوێنەر هەست بە كۆمەلێك ناوەڕۆوبەتی و پێچەوانەیی لە كارەكەدا ئەكات .

ئەوەتا كەسەكەی سەلام كەسێكی رۆشنبیرەو بە شێوەیەك مەترسی مانەوەی لێكراوەو دور خراوەتەوە بۆ شارێكی تر . كەچی نوسەر ئەم راستیەی لەبیر چوەو هەركە كەسەكە ئەگاتە شارەكە، نوسەر ئەڵێت : «گەیشتە ئەو شارەی بۆی نێرابوو، وەك مەڕی گێژ بەدەوری خۆیدا خول ئەخوات » . خوێنەر بۆی هەیە بپرسێت بۆ وەك مەڕی گێژ بە دەوری خۆیدا خول ئەخوات؟! ئەگەر یەكەم جاریشی بێت، بچێت بۆ ئەوشارە، هەرگیز وەك مەڕی گێژی لێ نایەت، چونكە هەرهیچ نەبێت لەوەپێش لە چەند برادەرێكی، لە چەند دۆستێكی كە ئەوشارەیان دیوە، هەواڵی چەند ئوتێلێكی باش ئەپرسێت!! : ئەش پرسێت هەر گرنگ نی یە . چونكە خوێندەوارو رۆشنبیرەو هەرگیز نابێتە مەڕی گێژ!!!.

لەپاشدا كەباسی ئوتێلەكە ئەكات ئەڵێت : « چۆن ئوتێلێكە ئەڵێی چۆلەوانیە، وەك ئەشكەوت دەنگ ئەداتەوە». كەچی ئەوەندەی پێ ناچێ ئەڵێ : «خۆ قرەقرو زرمەزلێی قاتی خوارەوە هەرباس ناكرێت و ئەڵێی مەزاد خانەیە »، خوێنەر بۆی هەیە بڵێت : بافەرمانبەرەكە لەنهۆمی سەرووتریش بێت، گریمان ئەو نهۆمە چۆڵیش بێت، ئەگەر خوارەوە مەزاد خانەبێت !! ئایا سەرەوە ئەبێتە ئەشكەوت و دەنگ بداتەوە ؟!. ئەمە بێ گومان پێچەوانەی یەكترن .

كە دێتە سەر باسی دائیرەكە، چۆنی زانی بەڕێوەبەرەكە سەرەواوی لە سكدا نی یەو كابرایەكی گەلحۆیە . ئەبوایە بە دایەلۆگ یا مەنەلۆژی بەهێز زەمینە بۆ شە فیكریەكەی بەڕێوەبەرەكەی دەرخستایە . ئەگەر فەرمانبەرەكە بەوەدا بەگەلحۆی داناوە چونكە ناردویەتیە بەشی ئەرشیف، بە هەڵەداچوە، چونكە بەشی ئەرشیف لە دائیرەكەدا بەشێكی وەستاو . ئەویشی بۆیە ناردوە چونكە مەترسی لێ ئەكات لەبەشەكانی تردا . ئەمە جگە لەوەی زۆربەی بەڕێوەبەران كە فەرمانبەرێكی نوێیان بۆ ئەگوێزرێتەوە، تا بەتەواوی شارەزای نەبن لەتواناو كاركردنیا، نایخەنە جێی لێ پرسینەوەی گەورەوە . نەخۆازەلا ئەمیش كە بەتایبەتی گواستراوەتەوە . جگە لەوە باوەڕنامە مەرجێكی سەرەكی نیە لەدانانی كادیرو بەڕێوەبەرەكاندا، بەتایبەتی ئەگەر یەكێك تواناو لێهاتویی تیا دەركەوت لە بەڕێوەبردن و زانیندا .

هەروەها ناو هێنانی شاعیرێكی مەزنی وەك گۆران ئەبێت لەم چیرۆكەدا لەبەرچی بەكار هاتبێ . تۆبڵێی هەر مەسەلەی خۆمالیە تەكە بێت ؟!!.

وەك لەسەرەتادا ووتم ، كەسەكانی سەلام واقعیەو لە گەڵماندا دەژین، بەڵام عەیبی هەرە گەورەی ئەم نوسەرە ئەوەیە خۆی لەبیری خۆیدا چاك جێگایان بۆ ئەكاتەوەو باشیان ئەناسێ، بەڵام كە ئەیان خاتە چیرۆكەوە، پڕبەپڕ بۆی دەرناچێ و لای خوێنەر ئەو وێنە روونەی كە نوسەر وویستویەتی بیكێشێت، دروست نابێت . لەبەر ئەوە زۆر جار كە ئەو (واتە سەلام) ویستویەتی كەسێكی رۆشنبیری سەر بەزمینەیەكی فیكری بەهێز پیشان بدات ، راستەو راست لای خوێنەر پێچەوانە دەرچوە بە كەسێكی لاوەكی و بودەلەو گەمژەل دانراوە، لەبەر بێ هێزی دایەلۆگەكان و ئەو مەنەلۆژە ساردانەی نوسەر دایان ئەنێ .

ئەوەتا كەسێكی وەك ئەم فەرمانبەرەی كە لەسەر مەسەلەیەكی رۆشنبیری بەهێزو هەست پێكردنێكی ا قوڵەوە دورخراوەتەوە، كەچی سەلام هەر سەری گلێڵەكەی دەرخستوەو بەناخی پاڵەوانەكەدا شۆڕ نەبۆتەوەو نەیتوانیوە معاناتەكە بە تەواوی و بە بنەڕەتی مەسەلەكەوە ببەستێتەوە .

بەبێنی خۆمان بێت، سەلام نەیتوانیوە ئەوە دەرخات كە بۆ دورخراوەتەوە، رەنگە هەبێت بڵێت : لەوانەیە لەسەر دزی، بەرتیل، دووزمانی بێت !!... كە بێ گومانم سەلام لای خۆی ئەزانێ بۆ دورخراوەتەوە، بەڵام وێنەكە لای خوێنەر روون نی یە . نوسەر ئەیتوانی ــ ئەگەر بەهیماش بێت شتێكی وا دەربخات كەمەسەلەكە هیچ ئەوانە نیەو شتێكی ترە. تەنانەت نوسەر مەبەستی سەرەكی چیرۆكەكەشی بەتەواوی روون نەكردۆتەوە كە مەسەلەی مەلحەمەكەیە .

تەكنیك لای سەلام، ئاشكرایە خۆی زۆر ئەبەستێتەوە بە دایەلۆگەوە كە مەرجێكی باشی چیرۆكە . بەڵام بێ پەروا گەڕانەوە (تداعی) بەكار ئەهێنێ، بێ ئەوەی بەتەواوی شوێنی ئەو گەڕانەوانە دیاری بكات، پایێویست بەوە بكات . زۆربەی تداعیەكانی زەمەنین، تداعی شوێن و تداعی سایكۆلۆژی و لە چیرۆكەكانیا وونە . لەبەر ئەوە جۆرە هەناسە سوارو پسانێك بە تداعیەكانەوە دیارەو ئەو معادەلە موضوعیەی كە دیوی ناوەوەی كەسەكان ئەبەستێتەوە بە دیوی دەرەوەیان دیار نی یە .

زمانی خۆماڵەتی چیرۆك لای سەلام، زمانێكی جوان و پاراوە بەتایبەتی لەو چیرۆكانەی ژیانی گوندو چیاكان دەرئەخات، لەم چیرۆكەدا ئەو زمانەشم بەدی نەكرد .

لە كۆتاییدا، سڵاوو رێزم بۆ هەرسێ چیرۆك نوسەكە . سوپاس بۆ گوێگرتنیشتان .

○ رەوف حەسەن ○

# خۆماڵیتی لە چیرۆکی کوردیدا

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقاو خرۆشی ڕۆحی بێگانە میزاجی کوردەواریم تێکچوە ، دەروێش عەبدوللا دەخیلت بم دەسا بەو لاوکو ئای ئایو حەیرانە شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی ماتو چۆلم کە لە بیتهوفن گەلێ زیاتر بە ڕۆحم ئاشنای وەللا دە ، ئەی دەروێش ، سکالایێك لەگەڵ ڕۆحی کلۆلم کە .

گۆران

ڕەنگە نزیکترین پێناسەیێکی ئەدەبی خۆمالی : ئەدەبی نەتەوەیی بێت .. ئەمەش بە مانا فراوانەکەی نەك بەمانای ڕامیاری ڕووت .

چیرۆکی کوردیمان .. هەر لە سەرەتای چاو هەڵهێنانی‌یەوە شناسنامەی نەتەوەیی خۆی هەلگرتوەو تامو بۆو ڕەنگو ڕوخسارو دەنگو سەداو ئاوازی کوردیی پێوە بوە ..

بەڕای من سیما خۆمالیەکانی چیرۆکی کوردی بەتایبەتی‌و هونەری کوردی بەگشتی لەم پێنج خالەدا کۆ دەبێتەوە : ــ

١ ــ زمانێکی ڕاستەو ڕەوانی کوردی .. لەپاڵ گشت ئەو ئایدیۆمەو پەندی پێشینانو قسەی نەستەقو بەتوێکڵو نوکتەو مەتەلانەی کە لە بڕبڕە پشتی زمانەکەمان دا هەن .. سەرباری ئەو بەیتو لاوکو حەیرانو شیعرە فۆلکلۆری‌یەکانی تر کە هەردەم بە سەرزاری کۆچەرو جوتیاری کوردەوە بوە لە کاتی کارکردن داو هەروەها لە سەر زاری ئافرەتو دایکانی کورد بووە بۆ کۆرپەکەیان .

٢ ــ خوو ڕەوشتەو نەریتی کۆمەڵایەتی باو .. لە شادی وشینو جۆری بەرگو کاڵاو خواردەمەنی میللی‌و شێوەی خانوو بەرەو پیشە میللیەکانو .. هتد .. کە مەسەلە ئاینی یەکان دەورێکی گرینگیان تێدا دەبینن .

٣ ــ مەلبەندی ژیانو گوزەرانی کورد .. لە خیلەو خوار بەرەو گەرمیانو خێڵەو ژوور بەرەو کوێستان .. بەشارو گوندو دەشتو چیاو دۆڵو ڕوبارو شوێنەواری دێرینو کۆڵانو شەقامو گەرەکەوە .. کە سەرجەمی ئەمانە پێوەندی‌یێکی ڕاستەو خۆیان بەباری ئابووری‌و ڕامیاری‌و کۆمەڵایەتی‌و جوگرافیەوە هەیەو هەروەها جۆری ڕووەکو ئاژەڵو بالندەش .

٤ ــ مێژووی قۆناغەکانی نەتەوەو خەباتو ڕاپەڕینو ڕووداو بەسەرهاتی تری کۆمەڵایەتی .. ئەمانە چ تایبەتی بن یا هاوبەشی بن لەتەك نەتەوەکانی تردا ..

٥ ــ لەهەموو ئەمانە گرینگتر .. مرۆڤی کورد خۆیەتی .. کە لە ئەنجامی کارتێکردنی ئەوانەی باسمان کرد هەمووی یا هەندێکی .. ئەو مرۆڤەی لێ دەر دەچێت کە مەبەستی سەرەکیمانە بە هەموو هەستو نەستو بیروباوەڕو ئومێدو ئاواتەکانیەوە .. بە ناوو نازناوو تیرەو خێڵی خۆیەوە .. بەروخسارو ڕەفتاری زبری خۆیەوە .

ئەم خالانە بنەمای باسەکەمانن .. دوور نیە یێکسەر ڕوو بەڕووی ئەو هەقیقەتە ببینەوە کە لە کۆمەڵێ پرسیاردا خۆی دەنوێنێ :

ئایا شاخو کێوو کانی‌و دار گوێزەکان تەنیا لە مەلبەندی ژیانی ئێمەدا هەن !؟

ئایا ئایین نەبۆتە هۆی لێکچوونی کۆمەڵێ نەریتو بیروڕاو

ڕەفتار ؟!

ئایا نەتەوە جۆراو جۆرە نزیکەکانی یێکتر مێژووی خەباتو ڕاپەڕینو ژینی کۆمەڵایەتی هاوبەشیان نیە؟!

بە دەیان پرسیاری تر کە وەڵامی هەر هەموویان : بەڵێ وایە یە ..

کەچی ئەم هەموو لێکچوونانەی نێوان نەتەوەکانی دنیا تا ئێستا نەبوونەتە هۆی سڕینەوەی مۆرکی خۆماڵی و ئەدگاری تایبەتی نەتەوەکان .. چونکە .. هەر بۆ نموونە .. ئەگەر لە سەر هەموو چیاکانی دنیا بەفر ببارێت .. ئەوا لە چیرۆکی کوردیدا ئەو بەفرە بەسەر چیایێکدا دەبارێ کە ناوی قەندیلە، ئاکۆیە .. یا پیرە مەگرونە .. چیاکانی کەشمیر نیە .. جا ئەوە چییە ؟! فەرقی چیە ؟! هیچ ؟ باشە ئاخر ئەو بەفرە بەسەر جوتیارێکی کوردا دەبارێ بە کڵاوو جامانەو فەقیانەو شرواڵو مراخانییەوە .. بە پشتێنو جاش کەوشەوە .. ئێ .. جا ئەمە چیە ؟! جوتیارەکانی کشمیریش هەر مرۆڤەو چەوساوەشە .. ئاخر ئەم جوتیارە ناوی حەمەدە .. یا لالۆیە .. ئەو ڕوبارەی لە چیرۆکێکی کوردی دایە ناوی تانجەرۆ یا سیروانە .. بەڵام لە چیرۆکی ڕووسیدا ناوی دۆن یا ڤۆلگایەو .. ئەمانە چی لە مەسەلەی مرۆڤەکە دەگۆڕێ ؟! ئەو مرۆڤانەی لە ڕۆخی هەر بێکێکیان دەژین کۆمەڵێ ئومێدو باوەڕو ئەفسانەو داستانو بەندی تایبەتیان لە دەوریان هۆنیوەتەوە ئەو مرۆڤانە گشت خاکو چیاو روبارو سروشتەکە بە موڵکی خۆیاندەزانن ئەگەرچی بستێکیشیان نەبێت دەوارێکی تیا هەڵدەن .. ئەوانە هەریێکەیان لە دێر زەمانەوە خوێنو ئێسکو پروسکیانو بیرەوەریو خۆشیو ناخۆشییان تێکەڵی بووە .. ئەمە لە ئەدەبو هونەردا گرینگە .. تێ ناگەم بۆ وێنە گرتنو کارتێکردنی فلچەی هونەرمەندێك .. یا خامەی چیرۆکنووسێك لەبەری گران بێت .. بەڵام خوێن ڕشتن بۆ پارێزگاریو سەربەستی هێند هەرزان بێ ؟!

ئەی ئەو بەرهەمانە نابنە نوێنەرێك بۆ پێناساندنی ئەمانە بە گەلانی جیهان ؟!

هەندێ لەنووسەرانمان خۆماڵیێتی چیرۆك بەوەپێوەرە دەپێون کە چیرۆکێکی کوردیمان وەرگێڕایە سەر زمانێکی تر .. بناسرێتەوە .

ئەم ڕایە پەسەندە .. ڕەنگە بێگانەیێکی شارەزا بە تەنیا ناوی پاڵەوانەکە ئەمەی بۆ بچێتە سەرو ئێمەش ئەم مەبەستەمان بێتە دی .. بەڵام بەلای خۆمەوە ـ ئێستاکە ـ هەوەندە قایلم : چیرۆکێکی بە کوردی نوسراو .. خوێنەرێکی کورد کە خوێندییەوە هەست بەوە بکات کە بابەتێکی



کوردییەو هیچیتر .. چونکە نموونەی ئەو چیرۆکانە زۆرن کەوا دەزانیت چیرۆکێکی لاوازو ناشیانەی بێگانەیەو هەروەها نەزانانەش تەرجەمە کراوە .

لەپاڵ ئەمەشدا زۆر چیرۆکی کوردی دەبینین کە هەموویان پڕن لە زۆرانبازیی چینایەتی .. بەڵام نموونەی ڕاستەقینەی مرۆڤی کوردییان تێدایەو ژیانو گوزەرانو دەنگو ڕەنگی کوردەواریانەیان تیا دەبینیو دەبیسی .. لەو چیرۆکانە

( لەخەوما )ی جەمیل سائیب .. ( دوانزە سوارەی مەریوان )ی پیرەمێرد ، ( مەنۆچەر و خازێو کوێرەوەری و ژانی گەل )ی بلەو ( پێشمەرگە ) ی د. ڕەحیمی قازیو ، ( قەلای دمدم)ی عەرەبی شەمۆو ( شەهیدانی قەلای دمدم)ی مستەفا سالح کەریمو ، ( شمشالی شوان )ی محەمەد سالح سەعیدو ( بێ ولات نیمو ئاسۆو دوو چاوی لێلی ) محەمەد مەولود مەمو (چای شیرینو چاڵی جەرگی پیرێژنو ڕووی کردەوە شاخو کانی ڕەحمانو سەفەرێکی ئەفسوناوی ) حسێن عارفو ( ئەڵمان کوردیو دلداری قەدەغە نیە )ی د. مارف خەزنەدارو ( خانزاد )ی جەمال بابانو ( شایەکەی ڕەشەی خەجە لاوو ڕۆنە زەنگی حەمەسەن)ی عەلادین سەجادیو ( تونێلی دەربەندەکەو شاری خامۆش )ی کاکە مەم بۆتانیو ( نازدار )ی محەمەد عەلی کوردی و ( بەڵام کوردمو خۆری ئاوابووو ، دیناری ئاغا )ی د. کاوس قەفتانو ( شەهیدی زولمە کفنو شۆردنی ناوێو زوربەی چیرۆکەکانی تری ) حەسەنی قزلجیو (شای قەرەجەکانو گردی شەهیدانو سەیرانێك لە ئەزمەڕو هەڵپەڕکێیێك لە بلکیان ) ی محەڕەم محەمەد ئەمین و ( قولاپی چاوەکانو سێبەری ئەسپە شێ )ی



محەمەد فەریق حەسەن‌و ( شــوان‌و شوێنــەوار )ی ڕەوف بێ‌گەردو ( چەپکێ نێرگزی تایبەتی ) شیرین .ك و ( گۆشەیێك لە ژیانی ڕەعناو فەقێ عەباس ...) ی ئەحلام مەنسوور

یەکێ لە شتە هەرە تایبەتیەکـانی نەتەوەکەمـان شایی‌و زەماوەندو هەلپەرکێ‌یە .. هەلپەرکێی رەشبەلەك .. جـا ئیتر لە زەماوەندی بووك گواستنەوە دابێت .. یا ئاهەنگی جەژنی نەورۆزو سەیران‌و خەتەنە سووران‌و بۆنەکانی‌تر .. ئەو میللەتەی سالەهای سالە لەژێر باری گرانی چەوساندنەوەو کوێرەوەری دابە ئـەم نەریتە میللیەی خۆی ون نەکردوە و بەجۆری ڕەگی بتەوی لە قولایی‌دا چەسپاندوە ، وام لێ دەکات بلێم .. هەلپەرکێ چەپی لە زمان کەمتر نیە لە مـەسەلەی خۆمالی‌دا .. هەلپەرکێی کوردیی هاوشانی زمانی کوردی‌یە.. ڕەنگە بەهەلەدا نەچوو بم ئەگەر بلێم : ئەو کوردەی هەلپەڕکێ نەزانی زمانی کوردیش نازانێت .. تەنانەت جاری وا هەیە پێش زمـانیش دەکـەوێت . زۆر جـار کە ناتوانین لەگەل بێگانەدا لـە یێکتـری بگەین‌و خۆمانیـان پێ بنـاسێنین .. یێکـەر دەست دەگرین‌و ئیتر سێ پێی ، چەپی ، گۆلشێنی ، ڕوینـە ، سوێسکەیی ، شێخـانی .. هتد دای دەمەزر ـ ێنین ..

ئەم ڕەوشتە ڕەسەنەمان لە چیرۆکی کوردی‌دا بە جوانی ڕەنگی خۆی ڕشتوە .. جەمال بابان لە چیرۆکی ( خانزاد )دا زۆر نازدارانە باسی دەکات :

[ کوڕگەل هاتن .. ڕژانە ناو شایی کەرانەوە .. هەر کوڕە چوە دەستی کچێکەوە .. هەر پیـاوەش چوە دەستی ژنێکەوە .. دەستیـان بە هەلپەرکێ کـرد .. بـە هەموو هێزێکیانەوە ئەیان کوتا .. چونکە هەر ڕۆژێکەو ئەمڕۆ .. ( تا دەگاتە ) .. بۆنی مێخـەك‌و سمل‌و ڕەشە ڕیحانەی ژێر ملی ئافرەت پیاوی کاس ئەکـرد .. زڕەی پلپلەو ملوانکەو خشـەی کەوای سورمەو کـراسی قەنـەوزی ئالـ ورشـەی سوخمەی کۆلۆانـەو دەسمال .. لـەگـەل دەنگی دەهۆل‌و ئاوازی زوڕناش کە جار جار تێکەلاو ئەبوون‌و هەندێ جاریش بەرەنگاری یێکتر ئەبوون ئەوەندەی تر خەلکەکەی بە پەرۆشتر ئەکردو ئەی هێنانە هەلەکە سەماو جوولەو قریوە .. تـا تەواو ماندوو بوون‌و لەپەل‌و پۆ کەوتن‌و دەستیان بەردا ](١)

ئەحلام مەنسووریش لە چیرۆکی (فەقێ عەباس‌و دیمەنێکی لەیاد نەچوو ) دا لایـەنێکی زۆر وردی زەمـاوەندی کوردی وێنەگرتوە ، ئەویش ڕەفتارێکی تایبەتی مندالانی کوردە لە کاتی هەلپەرکێ‌دا و دەلێ :

[ هەموو منالانیش لەگەل ئاوازی دەهۆل‌و زوڕنـاکەدا شانیان هەلتـەتەکاندو هـەندێکیشیان فەقیـانەی ئافرەتان‌و پیاوانیان لە ڕەشبـەلەکە کـەدا بەیێکەوە گرێ دەدا .. (تـا دەگاتە ) .. سەرنجی ئەو ڕەشبـەلەك‌و هەرایەم دەدا . کە ناو بەناو دەنگی (شاباش) دەهۆل‌و زوڕناکەی ڕادەگرت .. خەلکەکە لە گەرمەی شایی‌کردن‌و سێ‌چۆپی بوون .. ](٢)

حەسەنی قزلجیش لە چیرۆکی (کەشکۆلی جادوویی ) دا زەماوەندی ناسکۆل‌و وەیسە دەگێرێ‌و سێ ڕۆژ بـە تەقەی دەهۆل‌و زوڕنا کوڕو کچ‌و پیـاو ژنی ئـاوایی هەمە چەشنە هەلپەرکێی کوردی هەلدەپەڕن(٣)

لە چیرۆکی ( شاییەکەی ڕەشەی خەجەلاو ) ی عەلادین سەجادی دا کاتێ [ کوڕو کال سەیریان کرد وا ئاغا چوو بۆ ناویان ئیتر لە خۆشیانا سێ پێ‌یو ( فەتاح پاشا ) دایانگرت ئاغە جار جار ڕووی ئەکردە « شاکل » ـ سەرچۆپیەکەی بە دەستەوە بوو ـ ئەی وت : ها ! شاکە ! لام وایە هەلپەرکێت لە بیرچۆتەوە .. چاك گەرمی ناکەیت ؟! شـاکەم شاکە بوو کەگوێی لەم گفت‌و لفتە ئەبوو ئەوەندەی تر شێت ئەبوو ! .. قوڕ بەسەرە خۆی پڕووکان ](٤)

محەمەد سالح سەعید لە چیرۆکی ( شمشالی شوان)دا لە جیاتی دەهۆل‌و زوڕنا . شمشـالی کاکلی شوان بە کاردێنێ و چ بۆ هەلپـەرینی کچگەلی نێو دەشت‌و دەرو لـەکاتی کنگر هەلکەندن‌و کارکردن‌دا و چ بۆ زەمـاوەندەکەی خۆی لەگەل خەرامان دا(٥).

لەم چیرۆکەدا بەڕاستی شوانێکی گەنجی کورد بە هەموو

رەفتارێکی ڕەسەنی گونـدە وە دەبینین .. شوانی لای ئێمە لەزۆر ڕووەوە تایبەتێتی خۆی هەیە .. ڕەنگە شمشـاڵەکەی دەورێکی گەورەی هەبێ ، ڕەنگە شوانیتر ڕەبابە بەکار بێنێ .. یاشوانی وڵاتانی دوورتر ( کاوبۆی ) نـاو بێت .. ئەوا لـە جیاتی کاڵۆك تفەنگەو ئەسپی پێیەو لە جیـاتی شمشـالیش گیتار .. ئیتر شوانی لای خۆمان کە شمشـاڵو کاڵۆکەکەی واز لێهێناو تفەنگی کردە شان .. ئەوا دەبێتە شتێکی ترو نـاوێکی تری لێ دەنرێت .. وەك لـە چـیرۆکی ( شـوانو شوێنەوار ) ی ڕەوف بێ گـەردا بەدی دەکرێت .. ئەو کاتە .. لەژینی سـادەو سـاکاری نێو مـەڕو ماڵاتـەوە دەچێـتە نێو ژینێکی نـوێیی پڕ لـە تـاقیکـردنەوەی خـەمو ئـازارو ئـەنـدێشـەو خـۆشیو ئومێـدەو زیـاتر ئـاسۆی بیـرو لێکدانەوەی فراوان دەبێت و شوانیەکەی گەورە تر دەبێت .. [ لە بەرنازی چـاوەکانت شوانییـەکەم گەورە تر دەکەم ، شمشـاڵەکەی بەر پشتێنم بەشتێکی قورستر دەگۆڕمەو ](٦)

نێرگز ڕنین .. کنگر هـەڵکـەندن .. بنـە گۆزروانو کووزەڵە و بەنگۆکەو .. هتد .. ئەمانە شتی تایبەتین بـە ئاوو هەواو سروشتی مەڵبەندەکەمانەوە .. بەتایبەتی نێرگز هەر هیچ نەبێ بەنـدە بە زەوقی میللیمـانەوە .. لە وڵاتانی تردا گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ دەکرێتە دیاریو دەفرۆشرێت .. لای ئێمە نێرگز .. منداڵان سەرەڕێی بە ئوتومبیلو ڕێبواران دەگرنو چەپکە نێرگزیان پێ دەفرۆشن . کێژان تەڵە نێرگزو تەڵە ڕیحانە لە پەرچەمو ئەگریجەیان دەدەن .. یا دەیکەنە دیاری دەست .. لە چیرۆکی ( شمشـالی شوان ) دا محەمەد سـالح سەعید بایەخێکی تایبەتی بەم گوڵە جوانو خۆشەو کەم تەمەنە دەدات .. کچەکەل دوای کنگر هەڵکەندن [ گەیشتنە ناو نێرگزە جاڕەکەوە دستیان کرد بە کۆڵ دانانو کەوتنە نێرگز ڕنینو هەموو یێکێ باوەشێکی چاکیان کردو هاویشتیانە ناو کۆڵە کانیانەوە ](٧)

شیرین . ك لە چیرۆکی ( چەپکێ نێرگزی تایبەتی )دا نێرگزی کردۆتە دیاری دەستی دلداران .. (دارا)ی پاڵەوانی چیرۆکەکـە لە سەبەتـەیێك دا نێرگز دەفرۆشێت .. بـەڵام چەپکێکی تایبەتی بۆ ئەو کیژە نازدارە خوا پێداوە داناوە کـە خۆشی دەوێت .. بۆیی تایبـەتیـە چونکـە تـاقە گـوڵاڵە سوورەیێکی تێدایە.. کە کێژۆلەکە دێت وەك دیاری نای‌بات.. بەڵکو پارەی بۆ فڕێ دەدات .. دیارە .. بە ئاشکرا دیارە .. خۆشەویستی هەقی بەسەر خۆماڵییەوە نیە .. خۆشەویستی بەدەنگ هەستو سۆزی نەتەوایەتیـەوە نایەت .. بوێ لە ڕۆژی داهـاتوودا دارا سەبـەتەکـەی پڕ دەکات لە چـەپکە نێرگزی چون یێکو هی تایبەتی تێ ناکات ..(٨)

لە ڕەوشتو نـەریتە کۆمـەڵایەتیەکانمـاندا .. گەلێ ڕەفتارو بڕوای تایبەتیمان هەیە .. هەر لە چونە سەر مەزاری شێخو مەرقەدو دووعاو نوشتەوە .. کە حەسەنی قزلجی لە چیرۆکی ( نوشتەکەی ئامینەخان )(٩) داو حەمە ڕەشید فەتاح لە چیرۆکی ( پیاو چاك )(١٠) دا د. کاوسی قەفتان لە چیرۆکی نزای سێ بەسێ )(١١)و ( توورەکـە )(١٢) داو هـەروەهـا چیرۆکنووسانی تریشمان پەردەیان لە سەر ناواخنی ساختەو پووچو چروکی ئەم ڕەفتـارانە هەڵداوەتـەوە .. تا دەگاتە [ کلك بڕینو ئەتك کردنی ولاغ ](١٣) وەك لە چیرۆکی ( سێبەری ئەسپە شێ)ی محەمـەد فەریق حەسـەن دایـەو خووێکی باوی نێو کۆمەڵەکـەمـان بوە بۆ تۆڵە سەندو دەستدرێژی کردنیش ..

د. مارف خەزنەدار لە چیرۆکی ( دلداری قەدەغە نیە)دا باسی کچ هەڵگرتن یا ڕەدوو کەوتن دەکات(١٤) کە ڕەفتارێکی زۆر تایبەتییە لە ناوچەیێکی کوردستاندا .. جگە لەمەش هەر لەو چیرۆکەدا ئیدانەی مارە بڕینی منداڵ لە پشتی بێشکەدا دەکات ..

شـاکیر فەتاح لە چیرۆکی (چەقاوە سوو)دا باسی دەستو دلفراوانی گەلی کوردمان دەکات وەك ڕەوشتێکی ڕەسەنی نێو کوردەوارییو دەلێ !

[ میوانـدارێی لە کـوردەواری دا ئەمـەندە باوە کەس ناوبانگی بەدەست بلاوی دەر ناچێ .. تەنیا چرووكو دەست ووچاوەکان لە ناویان داناودەر ئەکەن .. بۆ پیاوەتییو بەدەورو پشتا هاتنی میوان : ناسیاو بێ یان نەناسیاو .. هەژارەکانیش وەك دەولەمەندەکان میوانداریـان گەیـاندۆتە ئەو پـەڕی چاکی .. هەتا هەندێ جار وابوە کە خانە خوێ خۆی دوو چـاری قـەردو نابووتی کردوە بـەڵام میوانی لە مـاڵ دەر نەکردوە ](١٥)

هەر لەو نەریتە باوانەی لە نێوماندا هەبوو ..

[ ئاهەنگی سەمەنی لێنانە لە شەوی نەورۆزا ](١٦) کـە محەڕەم محەدئەمین لە چیرۆکی ( گردی شەهیدان دا باسی کردوەو چۆن لەو شـەوەدا دەکرێتە شـاییو هـەڵپەڕکێی ڕەشبەڵەکو ... هتـد سـەرە ڕای ئەوەی لە چیرۆکەکانی تریدا باسی سـەیرانی ئـەزمرو بلکیان دەکاتو پەنجـە بۆ مەولووی ڕادەکێشێ ..

ئەو نموونانەی تا ئێستـاکە خستمـانە بەر چاو .. پاڵەوانە خۆماڵییەکانیـان سـەرە ڕای ڕەفتـارو گفتـاری کوردانەیان هەموویان هەر بەبەرگو کاڵای کوردییەوە بوون.. هەر لە هی ژنانـە تا دەگاتە پیـاوانە .. هەر لە دەسماڵو

کەواو سوخمەو فەقیانەو پانی بەرز .. تا دەگاتە ڕانکو چۆغەو شرواڵو مرادخانیو کڵاوو جامانەو کەوشو کڵاشو پشتوێنو هتد ..

حسێن عارف لە چیرۆکی ( چاڵی جەرگی بیرێژن )دا ئەم گفت و گۆیەمان پێڕادە گەیێنێ :

[ ـ ڕانكو چۆغەیێكو جووتێ کڵاشی دۆمی ؟

ـ با ببینم .
ـ ڕانکو چۆغەی لە بەرابوو ؟!
ـ نەء .
ـ پێویست ناکات ](١٧)
هەروەها

[ ـ ئەبێ خەڵکی ناو شار نەبێ

ـ بەجاش کەوشەکانیا لە لادێیی ئەچێ ](١٨)
هەروەها

[ـ پشتێنێکی چیت کودمری ڕەشباو

ـ بەقوربانی دەمت بم
ـ شرواڵو ستار خانی یێکی ..
ـ نەء .. توخوا نەء .. ](١٩)

جەمال بابان لە چیرۆکی ( خانزاد ) دا وێنەیێکی فتوگرافی ڕەنگاو ڕەنگی تەواوی ئاغایێکی کورد دەگرێ .. بەم شێوەیە :

[ دەمانچەیێکی بەرە بێلی لە خۆی داوە ، خەنجەری دەبانی کردوە بە قەداو تەزبیحی کارەمانی دەنك زەردی لە مستوەکەیەوە ئاڵاندوە .. دەسە سری سووری ئاوریشمی کردوە بەبەر پشتێنەکەیا ](٢٠) .

دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە ئەم شانو شەوکەتو بەرگو دەبدەبە هی جوتیارێك یا مسکێنێك نیە .. بەڵکو هی ئاغایێکە .. ئەوەی مسکێنەکەش لەبەری دەکات هەر ناوی بەرگی کوردییە .. لە هەندێ ڕووەوە لەوەی ئاغاکە دەچێت .. بەڵام چ قودمرەتە لە گرانبەهاییو فشو فۆڵی دا لەو بچێت؟! خۆ ئەگەر هاتو لە هەموو ژیانیدا تەنیا جارێك شەرواڵو مراد خانییێکی فشوفۆڵی فاسۆنی لەبەر کرد .. ئەوا دەبێ لە ( ڕۆژی ڕوونا ئەستێرەیێك ) نیشانی ئاغا بدات .. یا خود دەبێ بە پشتوێنەکەی سەرەو خوار بەدارا هەڵواسرێت .. وەك لە چیرۆکی ( ئەستێرەیێك لە ڕۆژی ڕوونا ) ی محەمەد فەریق حەسەندا هاتووە .. ئەوەتا ئاغا بە مسکینەکەی دەڵێت :

[ ئێ میرم .. بووی بەو پیاوەی جلو بەرگ لە هینەکانی من بکەی ؟ ها ؟ دەسا دەبێ بخۆی بەدەستم ](٢١) . هەر محەمەد فەریق حەسەن لە چیرۆکی ( قولاپی چاوەکان ) دا نازەنینی حەمە گەرمیانی بە بەرگی سادەو نازداری کوردییەوە نیشان دەدات .. سوخمە .. کۆڵوانە .. گۆو بەرۆك .. کوژەکە .. تەڵە ڕیحانەی لە قژدراوو بە هەنیەدا شۆڕ بوەوە.. هتد(٢٢) کرێکارە کوردەکانی چیرۆکی ( تونێلی دەربەندەکە ) ی کاکە مەم بۆتانی بە بەرگی کوردییەوەو بە ( کڵاو و جامەدانەی ڕەش هەڵگەڕاوی چڵکنەوە )(٢٢) کار دەکەن .

هەروەها لە چیرۆکی (بەردیش بەرگەی ئەم ئازارە ناگرێ‌دا، کێژۆڵە تەفرە دراوەکە (پانی بەرز)(٢٣)ی لەپێ دایە ..

کۆڵەکەیێکی گرینگی تری خۆماڵیێتی چیرۆکی کوردی سوود وەرگرتنە لە مێژووی دوورو نزیکمانو ئاوێتە کردنی خەباتو تێکۆشانو بەسەر هاتەکانی میللەتەکمان بەکارە هونەریەکەوە کە لە مەدا زۆر جار وای لێ‌هاتووە وشەی کوردو کوردستانو ڕاستەو خۆ بەکار بهێنرێت .. یاخود ببێتە ناونیشانی چیرۆکەکان وەك ( داغستانی من )(٢٤)ی ڕەسوول هەمزاتەڤو .. بەم جۆرە :

( شڤانا کورد ) ی عەرەبی شەمۆ ، ( نازدار ، یاژنی کورد لەلادێ )ی محەمەد عەلی کوردی ، ( بەڵام کوردم ) ی د. کاوس قەفتان ، ( قارەمانی ئافرەتێکی کورد ) ی أ. ب هەوری .. ( کورد تەڵاقی ناکەوێ ) ی د. مارف خەزنەدار .. هتد ..

ئەمانە وەك ناونیشان .. بەڵام ناوەڕۆكو مەبەستی ئەو چیرۆکانەی لاپەڕەیێك لە خەباتو مێژووی کورد باس دەکەن .

محەڕەم محەمەد ئەمین لە چیرۆکی ( گردی شەهیدان ) دا باسی ڕاپەڕینە خوێناوییەکەی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ دەگێڕێتەوە کە چۆن پیاوان لە سەنگەرو ناو شەقامەکاندا بە چەك هەڵمەتیان بردوەو ئافرەتانو منداڵانیش لە کۆڵانەکاندا بەکوتەك خڕکە بەردو پانی بەرز ڕوو بەڕووی داگیر کەران بوونەتەوە(٢٥) هەروەها لە چیرۆکی ( شای قەرەجەکان ) دا .. سەرەتا دەسنیشانی گەڕەکی ( هۆمەر مەندان )ی سلێمانی دەکات و ئەمجا باسی خەباتی نهێنی لاوانی کورد دەکات ... شای قەرەجەکان لە نێو دەواری خۆیانەوە گوێی لە قسەکانی لاوە کوردەکانی دەبێتەو هەستی نیشتمانیو نەتەوایەتی دەبزوێو بە ڕاوی چیرۆکە کە دەڵێت :

[ لەو ڕۆژەی کە تۆو چەند هەڤاڵێکی ترت .. لە نزیك نیشتەجێ کەی ئێمە .. لە پەنا دار گوێزەکەدا دادەنیشتن .. منیش لەو دیو تانەوە گوێم لە گفتو گۆتان بوو .. لە بارەی نەتەوەو نیشتمانەکەتانەوە ڕێکاو پلانتان دا دەنا .. بۆ ڕزگاری لە دەست داگیر کەران .. لەو ڕۆژەوە بۆم دەرکەوت کە ئێمەی

ئەرەج مرۆڤ نین .. هتد ](٢٦) .

د. ڕەحیمی قازی لە ڕۆمانی ( پێشمەرگە ) دا چیرۆکی حەیاتی نەتەوایەتی‌و چینایەتی میللەتەکەمان دەخاتە بەرچاو لە سەردەمێکی زۆر ناسکی ژیانی گەلی کورد دا کە ئەویش سەردەمی کۆماری ( مەهاباد )ە لە کوردستانی ئێران دا .. ئەم چیرۆکە بە تەنیا لێکۆلینەوەیێکی تایبەتی هەلدەگرێت لە خۆمالێتی‌دا .. چونکە تەنانەت دیالیکتە جیا جیا کانی زمانی کوردیشی لە چەند لاپەڕەیێك دا و لە سەر زمانی پالەوانانی بەکار هێناوە .. سەرە ڕای زوربەی لایەنەکانی تری گوزەرانی میللەتەکەمان .

د. کاوس قەفتان لە چیرۆکی ( بەلام کوردم ) دا مێژووی ئەو ڕۆژە دەگێڕێتەوە کە میللەتی کورد بەهۆی شۆڕشەکەیەوە شۆڕشی ئاگری داغ )ەوە .. چۆن گەورەترین ستەمیان بە دەستی تورکەکانەوە چەشت .. بە جۆرێك هەرچی ناوی کورد بوایە دەیان کوشت(٢٧) .

لە چیرۆکی ( دیناری ئاغا ) ش‌دا دکتور کاوس بە عالەمی ئاشکرا بانگی صافی نەتەوایەتی کورد دەدات و لەسەر زمانی پالەوانەکەیەوە دەلێت .

[ داوا دەکەین کە تۆو منالەکانی تۆ بەکوردی بدوێن‌و بنووسن‌و بخوێنن .. بێ سڵ کردنەوە بلێن کوردین‌و نەوەی ئەم شاخ‌و هەردەین(٢٨) .

چیرۆکی (ڕاوە بەران )یش ڕاو کردن‌و کوشتنی خێزانێکی هەژاری کوردە .. هەر بۆ ئارەزوو چەند تۆپێکیان پێوە دەنێن(٢٩) .

ئەم لایەنانە بە شێوەیێکی ڕاستەو خۆ لە چیرۆکی ( دوانزە سوارەی مەریوان )ی پیرە مێرد ( ڕێگای ئازادی ) محەرەم محەمەد ئەمین دا و .. هتد دەر دەکەوێت .. هەر وەها بە شێوەیێکی هونەری لە چیرۆکی ( جەوهەر ئاغا )ی عەلادین سەجادی و ( شاری خامۆش )ی کاکە مەم بۆتانی و ( هەلپەرکێ‌یێك لە بلکیان ) ی محەرەم محەمەد ئەمین‌و ئاسوو دوو چاوی لیلی ) محەمەد مەولود مەم و ( ژانی گەل ) ی بلەو چالی جەرگی پیرێژن ) ی حسێن عارف دا دەر دەکەوێ ..
حسێن عارف بە تاقە دێڕێکی زۆر پوخت .. لە چیرۆکی ڕووی کردەوە شاخ ) دا لە سەر زمانی پیرە مێردێکی دنیا دیدەی زۆر بۆ هاتوو دەلێ :

[ شەرە گەرەك‌و ئازایەتی .. سەفەر بەرو سەردایەتی شێخ مەحموود و کوردایەتی .. بەر دەرکی سەراو لێزمەی دەسرێژی مەترە لۆز .. ](٣٠) .

وا بزانم پێویست ناکات ناوی پالەوانەکانی چیرۆکی کوردی باس بکەین .. چونکە تەنیا چیرۆکنووسێکی وەك حسێن عارف بەتەنیا خۆی سەدان ناوی پالەوانی جیا جیای هەیە .. بە شێوەیێکی گشتی ناوی پالەوانی چیرۆکی کوردی یا ناوی کوردی پەتین یا ئەو ناوە عەرەبی‌و ئیسلامیانەیە کە بە زمانە کەمان دا تواونەتەوە وەك .. قالە..حەمە..عەزە .. عەولا .. مچە .. نەسە .. ڕەشە .. بلە .. هتد یا ئەوانەیە لە فارسەکانەوە تێکەلاوی ناوی کوردی بوە .. وەك .. ئافتاو .. خورشید .. جەمشید .. خەسرەو .. هتد .. یا ناوی شارو گەرەك‌و گوندو شاخ‌و ئێل‌و عەشرەت .. کە چیرۆکەکانی حەسەنی قزلجی بەشێکی زۆری لێ ناو بردوون محەمەد فەریق حەسەن لە دوو دێڕا کۆمەلێکی باشی لێ کۆکردونەتەوە لەسەر زمانی ئاغای مۆریاس لە چیرۆکی (سێبەری ئەسپە شێ )دا دەلێ :

[ شێخەلی شێ حوسێنی بەرزنجەو شەهێن بەگی شاهۆ بەگی هەورامان‌و مشیر ئاغای سابیر ئاغای هەمەوەنیان کردوە بە مودیر ناحیە ... منیش لەئێستاوە مودیری ناحیەی مۆریاسم ](٣١).

کۆلەکە هەرە گرینگەکەی خۆمالی زمانە .. زمانی کوردی .. مەبەستمان لە زمان زۆر شتە .. بە کورتی هەموو لایەنەکانی زمانە .. پەندو ئەفسانەی کوردی گێڕانەوە .. گۆرانی فۆلکلۆری قسەی نەستەق .. زاراوەی تایبەتی .. جوانکاری‌و ڕەوانی زمان لە نوسینی چیرۆك‌دا و کە مەندکیش کردنی خوێنەرو خۆشەویست کردنی زمانی کوردی لەلایان ..

[ هەبوو نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو ...

وادی بە وادی .. تەختی مرادی ](٣٢) ئەمەدەست پێکردنی چیرۆکێکی کاکە مەم بۆتانی‌یە بەناوی ) لە ئاهەنگی ڕاوی هەلوی ناو زۆنگاودا ].

( بابە خولێ گێژم مەکە )(٣٣) لە چیرۆکی بازنەدا ( هەناران‌و مەناران .. یاخوا داکاتە باران .. بۆ فەقیرو هەژاران )(٣٤) لە چیرۆکی ( بەردیش بەرگەی ئەم ئازارە ناگرێ)ی کاکە مەم‌و چیرۆکی (خانزاد)ی جەمال باباندا حەمە وەیسی پالەوانی چیرۆکی ( سەیرانێك لە ئەزمڕ)ی محەرەم [لەو لاوە لەسەر زگ پال کەوتبوو .. لەبەر خۆیەوە ( گورانی ) یێکی هەورامیانەی دەوت ](٣٥).

( ئامۆزا تۆ بالا بەرزی .. ئامۆزا تۆ بۆ من فەرزی](٣٦) ە ( چیرۆکی گۆشەیێك لە ژیانی ( رەعنا )ی ئەحلام مەنسووردا دەوترێت ..

[ سنجانی‌و سنجانێتم حەریرە .. پاو پووزی پەنیرە ...](٢٧) لە چیرۆکی (وەرزی کەوبوار )ی محەمەد فەریق حەسەن دا ..

کاروانچییەکەی کاکە مەم بۆتانی [حەیرانی دەوت دەرۆی ](٢٨) هەندێ پەندو قسەی نەستەقی کوردی هەیە .. ئەگەر وەك خۆیان وەریان گێڕینە سەر زمانێکی بێگانە ڕەنگە ببێتە نوکتە ..

وەك ( لە گوێی گادا نوستووم )(٢٩)ی چیرۆکی (چای شیرین )ی حسێن عارف .. یا (دەستی لەبنی هەمانەکەوە دەرچوو )(٤٠)ی چیرۆکی (دوژمنەکەی مام قیتەڵ) هەر ئەو هەروەها [ ئەسپێ لە باخەڵماناسە وزە لە گیانمی دەووت.. پێم نالێن ئێوە قنچکی پیازن یا سەلکی سیر ؟! کردبوویان و ڕۆژەکەی قەرەوەیسی](٤١) کە لە چیرۆکی (سەیرانێك لە ئەزمڕ)ی محەڕەم دا یە ..

زمانی تەڕو پاراوو سەرنج ڕاکێشەری نووسەرانی وەك بلەو سەجادی‌و شاکیر فەتاح‌و حسێن عارف‌و محەمەد فەریق حەسەن‌و ... هتد .. بە جۆرێ خوێنەر کەمەند کێش دەکات کەوا هەست بکات بەرامبەر تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگی نێو سروستە دلفرێنەکەی کوردستان وەستاوە .. نەهەست بە قۆرتەو گرێ دەکەیت‌و نە بە هەناسە سواری .. دەڵێی بارانی پەڵەی پاییزن‌و دەڕژێنە نێو وەردو دێراوەکانی لاپەرەکانەوە .. لەوێشەوە بۆ نێو دڵی خوێنەر .

عەلادین سەجادی لە چیرۆکی ( لەپێناوی ئافرەتا ) بەم جۆرە دەچێتە نێو باسەکەوە :

[ تافی هەرزە کاریمە .. تازە خەتم داوە .. ئێجگار کە ناوی خۆمم بیستۆتەوە کەس لە ژوور خۆمەوە نابینم سەر لەبەیانی‌یێك هەستام .. خۆمم ڕازاندەوە .. زرێ‌و تاسکڵاوم لەسەر کرد .. شیرو تیرم لەخۆم نا .. مەتالم خستە گازی پشت‌و ڕم بەدەستەوە . ماینێکی ڕەشبۆرم هەبوو ، پەلی لە ئاسمان ئەکوتا : سوار بووم‌و .. ڕووەو دەشت بە شوێن نێچیریکا .. تووشی ئەم کارەساتە بووم ..](٤٢)

هەروەها لە چیرۆکی (جەوهەر ئاغا)دا ئەم وەسفە بێ‌گەردە مان بۆ دەکات :

[ دەمە دەمی ئێوارە بوو . خۆمان کرد بەناو شارا .. زیڕەی زیل‌و زەنگۆلی پێشەنگی قافلەکەمان‌و جوانی‌و تەنتەنەی جل‌و بەرگی خۆمان‌و پڕمە پڕمی ولاغی کاروانەکەمان هەموو ناو شاری تەورێزی هێنابوە سەیر کردنمان ..

تیشکی ڕۆژەکە کە ئەی دا لە هەیاسەو تەیاسەی زەڕکەفتی پێشەنگەکە .. ئەتوت پڕ زۆڵەی زێڕ بڵاو ئەکاتەوە لەو ناوە دا .. دلبەرانی تەورێزی. نە ئەمە بوو چاو ببڕنە خۆمان .. نە ئەمە بوو سەرسام بن لە ڕازاوەیی بنەو بارگەکەمان ...](٤٣)

ئەم جوانکاریی‌و زمانە سفت‌و سۆڵەی چیرۆکی سالی چلەکان .. زۆر بە دەگمەن‌و تاك‌و تەرا ئێستاکە لە چیرۆكدا دەیبینین .. یێکی لەو چیرۆکنووسە دەگمەنانە کە ئەو زمانە پاراوە لە زوربەی چیرۆکەکانی‌دا بەکار دێنێ‌و بە شێوەیێکی هونەری ئەو سەردەمەمان دێنێتەوە یاد .. محەمەد فەریق حەسەنە : بەم وشە پاك‌و بێگەردانە سەرەتای چیرۆکی ( قولاپی چاوەکان ) دەهۆنێتەوە ..

[ ئێی نازەنینی حەمە گەرمیانی .. بۆ چوویتە ناو ئاوێنەکەتەوەو ڕازەکانتی لادەدرگێنی .. تا دوێنێ بوو لەگەڵ هەتاوی بڕژێنەری گەرمیان‌دا سەرتۆپی ناوچەکە بووی .. کە پرچەکانت سێبەنگی دەکردو بەسەر کۆلوانەکەت‌دا دەکەوتنە جۆلانە.. هەناوی کور گەلی ئاوایت بەر دەدایەوە .. کەمەند کێشی زەردە خەنەیێکت بوون ..](٤٤)

ئەمجا با ئاوڕێك لەو چیرۆکانە بدەینەوە کە زوربەیان بەناوی نوێخوازی‌و ڕوانگەیی‌و ئەدەبی سەردەمەوە وەك حوشتری لاوەکی کەوتوونەتە نێو چیرۆکی کوردیمانەوە بزانین بە هیچ تاوە دەزوویێکی قرچۆکیش بەم مرۆڤی کوردو ئاوو هەوای مەلبەندمانەوە بەستراونەتەوە ؟! ڕەنگە هەر ئێستاکە ( چیرۆکنووسێك !) ی هاوچەرخم لێ ڕاپەڕێ‌و بلێ : ئۆ هۆو .. ئەم هەموو بگرەو بەردەیەو سەر یەشەیەی بۆچی‌یە ؟! سیماو مۆرکی خۆمالێتی تەنیا خۆ دابڕین‌و خۆ جیاکردنەوەیە لە مرۆڤانی تری ئەم دنیایە .. بیرکردنەوەو هەوڵدانێکی بێ سوودە بۆ ڕاگیر کردنی ڕەوڕەوەی بەرەو پێشەوە چووی شارستانێتی .. بوارو دەرفەت تەنگەبەرو تەسك دەکاتەوە لە بەردەم نووسینی ئەدەبێکی مرۆڤایەتی و جیهانی دا .. با ئەدەبێکی مرۆڤایەتی‌و جیهانی بنووسین .. با ئاسۆمان فراوان‌بێ .. چیمانە بەسەر خۆمالێتی‌و مۆمالێتی‌یەوە ..

یا چیرۆکنووسێکی ڕۆشنبیر بێت بە قەناعەتی زیاترەوە بلێت :

باشە دەکرێت هەر چیرۆکێکمان نووسی پڕی بێ لەخەنەو وەسمەو دۆ کلیوو پالەوانەکەشی بەکەوش‌و کلاش داپۆشین‌و لەتەك دەهۆڵ‌و زوڕنادا بیخەینە هەلەکە سەماو هەرچی پەندی پێشینان هەیە هەمووی بلێ‌و لە نەورۆزا سەمەنی بخوات‌و لەشەودا خەریکی ساوەر کوتان بێ یا کۆلانان بکوتێ‌و لەخڕەی نێری نێری بلێ‌و بەڕۆژ ناتری حەمامی سوورەت بێ یا گەزۆو

